# هاوسەرگیری
# یان
# هەڵبژاردن



نوسەر : م.مودب پور
وەرگێرانی : هێمن محمد

2020

# هاوسەرگیری

# یان

# هەڵبژاردن

نوسەر : م.مودب پور

وەرگێڕان : هێمن محمد

جۆر : ڕۆمان

تایپ و بەرگ : هێمن محمد

ساڵی : ٢٠٢٠

**له نێو میترۆ ...**

(( فەریبا و شوهرە و مریەم وەستابوون و چاوەڕێی شەمەندەفەریان دەکرد کە بێت ، لە گەڵ یەکدی قسەیان دەکرد ، لە نێو میترۆ کۆمەڵێک خەڵکی لێیە کە زۆربەی ئافرەتن .))

فەریبا : کچ کاڵا یان شتێکی فرۆشتن نییە کە بیخەنە دوکانێکەوە و موشتەری بۆ بێت و ئەگەر بەدڵیان بێت ببەن و بیخەنە نێو ماڵەکەیان !

مریەم : ئەی مافی هەڵبژاردنی ئێمە دەبێت بە چی ؟ واتە ئێمە سزادراوین کە هەمیشە ئەبێت هەڵمانبژرێن ؟ مافمان نییە خۆمان هەڵیبژێرین ؟

شهرە : ئاخر چۆن دەبێت ؟ واتە ئەگەر ئەم سێ کەسە ئەم داب و نەریتە بگۆڕین ، ئیتر لەمەودوا لە جیاتی ئەوەی کوڕان بچنە خوازبێنی کچان پێچەوانە دەبێت و کچان دەچنە خوازبێنی کوڕان ؟

(( لەم کاتەدا فەریبا سەرنجی دەچێت بۆ لای دوو خانم کە لە تەنیشتیانەوە وەستاون و قسە دەکەن ، ئاماژە بە مریەم و شهرە دەکات کە ئەوانیش گوێیان لێ بگرن ))

یەکێک لە خانمەکان : تۆ بمری مەهین گیان ، سەد تمەن سەد تمەن لە خەرجی ڕۆژانەی ماڵم دزی تاکو پارەی ساڵۆنم کۆکردەوە ! بە گیانی تۆ بە چی بەدبەختیەک لەو خانمە کاتم گرت و ڕۆشتمە لای ،

بە مەرگی تۆ سێ کاتژمێری تەواو لە ژێر دەستی گیانم ئەدا تاوەکو سەرمی های لایت کرد !

تۆم کردە کفنەوە ئەگەر درۆ بکەم ! زۆر بە خێرایی خۆم گەیاندەوە ماڵ نەوەک پیاوەکەم زووتر بێتەوە بۆ ماڵ .

(( ئەم خانمە هەر سویندی بە گیانی هاوڕێکی دەخوارد ، شێوەی ڕوخساری هاوڕێکەی تێک ئەچێت بە شێوەیەک کە خەریکی بارودۆخی تێک ئەچێت ))

خانمی یەکەم بەردەوام دەبێت : کاتێک پیاوەکەم هاتەوە ڕۆشتمە بەردەمی بەڵام تۆم خستە ناو گۆڕەوە ئەگەر درۆ بکەم ، زۆر بە سادەیی و بە وشکی سەیری کردم و تەواو !

خانمی دووەم : واااااا ! خوشکم تۆ شتم بۆ باس ئەکەی یا خەریکی مەسایمی کفن و دفنی من ئەنجام ئەدەی !؟

(( خانمی یەکەم پێدەکەنێت و دەڵێت : ))

ئووا خاک نەکەنە گۆرتەوە ! خەریکم بە شێوەیەکی خۆش بۆت باس ئەکەن !

خانمی دووەم : باشە لە کۆتاییدا چی بوو ؟

خانمی یەکەم : پیاوەکەم هەر نەیزانی ڕەنگی پرچم گۆڕاوە !

خانمی دووەم : تەنها بڕوانامەیان هەیە لە جەوگرتندا خاک بە سەریان بێت !

خانمی یەکەم : پێم وت ئەحمەد هیچ گۆڕانکاریەکت نەبینی ؟ کابرا سەرێکی ئەملا و ئەولا پێکرد و وتی دیسان شوێنی قەنەفەکانت گۆڕیوە ؟ دەی پشتت دێتە ئێش . دەکەویت و دەمێنیتەوە سەر دەستم !

خانمی دووەم : گۆڕ بە گۆڕەکان ، ژنی خۆیان بە ئەم گەورەیە لە دووری دوو هەنگاوەوە نابینن بەڵام ئەگەر یەکێک لە ناو کۆڵان ....

(( فەریبا و هاوڕێکانی سەیری یەکتر دەکەن و چەند هەنگاوێک ئەنێن و بەو ناوەدا پیساە دەکەن و فەریبا دەڵێت : ))

ئەمانە چارەنوسی هەڵبژێردراوەکانە !

پاشان بە تورەییەوە بە هاوڕێکانی دەڵێت :

سەیر بکەن ! ئایندەی ئێمەش ئاوایە !

(( دوو کەسیش لە تەنیشت فەریبا و ئەوانەوە وەستابوون ، یەکێکیان کوڕێکی گەنج و یەکێک پیاوێکی کەچەڵ و باڵای کورت کورت ! لەوانەیە تا ئانیشکی فەریباش نەبێت !

هەردوکیان خەریکی قسەن :

کوڕە گەنجەکە : ئاخر خاڵۆ من ئەو کچەم خۆشدەوێت

پیاوە کەچەڵەکە : سەیربکە خاڵۆ گیان ، بۆ نمونە ئەتەوێت جوتێک پێڵاو بکڕیت کە ئەچیتە یەکەم دوکانەوە ڕاستەوخۆ ئەیکڕیت ؟

کوڕە گەنجەکە : دەی نەخێر

پیاوە کەچەلەکە : دەی ژنیش بەم شێوەیە ! خۆت ماشاء الله تێگەشتویت !

ژن هێنانیش هەر وەک جۆریک لە کڕینە ! کڕینێک کە هەمیشە کڵاو دەڕواتە سەر کریار ! ئێستە بەلایەنی کەمەوە بیست دوکان بگەڕێ ، یەک دانەیان هەلبژێرە و بیکڕە و بیبە بیخەرە نێو ماڵەکەتەوە ! بەم شێوە کەمتر زەرەر دەکەیت !

کوڕە گەنجەکە : واتە تۆ ئەڵێی دەست هەڵگرم ؟

پیاوە کەچەڵەکە : بەڵێ خاڵۆ گیان ، شتێک کە زۆرە کچە ! سەدانە ببینە و یەکێک بخوازە!

کوڕە گەنجەکە : ئاخر خۆشمدەوێت

پیاوە کەچەڵەکە : واز لەم قسانە بهێنە ! جوانترین و شازترین پێڵاو کە دڵی مرۆڤ بات تەنها شەش مانگ شێوەی هەیە ، دوای ئەوە لار دەبێت و شێوەی ناشرین دەبێت .

کوڕە گەنجەکە : وەڵا بڵێم چی ؟!

پیاوە کەچەڵەکە : سەیر بکە خاڵۆ ، کچ دەبێت چەند خاسیەتێکی هەبێت :

یەکەم جوان بێت

دووەم لەشی ڕێک و قەڵەمی بێت

سێیەم خوێندنی تەواو کردبێت

چوارەم ئیشێکی باشی هەبێت کە پارەیەکی زۆر وەربگرێت

پێنجەم هەر هیچ نەبێت خانویەکی هەبێ بە ناوی خۆیەوە بێت

(( کە ئەمانەی دەژمارد پەنجەشی لەگەڵ دەجولاند ))

دوای ئەوە دەستەکەی تری بەرز دەکاتەوە و پەنجە گەورەکەی هەڵدەبڕێت و بە کوڕەکە دەڵێ ئەمە چییە ؟

کوڕەکە پێدەکەنێت و دەڵێت :

شتێکی خراپە خاڵۆ ؟

(( پیاوە کەچەڵەکە بە چاو ئاماژە بۆ کوڕەکە دەکات و کوڕەکە پێدەکەنینەکەی دەوەستێت و ئاسایی دەبێتەوە و دەڵێت :

شەشەم خاڵۆ گیان

پیاوە کەچەڵەکە بە لاچاوێک سەیری دەکات و دەڵێت :

بەڵێ شەشەم دەبێت تێگەشتوو بێت و درک بکات کە پیاوەکەی تا نیوە شەو لەگەڵ هاوڕێکانی بچێتە دەرەوە و هیچ نەڵێت و بەرنامەکانی لێ تێک نەدات !

حەوتەم بەو شێوەیەی کە ئیشی دەرەوە دەکات ئیشی ماڵ و ماڵداریش تەرک نەکات !

کوڕە گەنجەکە بە چاو و برۆی ئاماژە بۆ خالۆی دەکات و ترس لە چاوەکانیدایە بەڵام خالۆی تێناگات و بە توندی قسە دەکات

پیاوە کەچەڵەکە : هەشتەم ئەوەیە کە چێشت لێنانی زۆر باش بێت و لەسەر کتێبی چێشتلێنان چێت و خواردن ئامادە نەکات !

نۆیەم : ئەوەیە کە زۆربلێ نەبێت و هەر وەڵامی مێردەکەی بداتەوە ! ئێستە ئەزانی بۆچی دەیەمم باس نەکرد ؟

چونکە دامناوە بۆ خەسوو !

مەرجی دەیەم ئەوەیە دایکی مردبێت یان توشی شەلەل بوبێت و بەلایەنی کەمەوە نیوەی لەشی لە ئیش کەوتبێت یا جەڵدەی لێدابێت ، ئەگەر هاتوو هیچ لەمانەش نەبوو ئەوە هەر هیچ نەبێت زمانی لاڵ بێت کە نەتوانێت جنێو بدات یان کەڕ بێت کە ئەگەر جنێویشی پێ بدەیت نیبیستێت !

کچ ئەگەر ئەم مەرجانەی تیا بوو ئەوە ئەتوانیت دەوری دوو ساڵێک تەحەمولی بکەیت !

ئەمانە دەڵێت و دەست دەکاتە پێکەنین !

(( کوڕەکەش قورگی وشک بوەتەوە و زۆر ئەترسێت ))

پیاوە کەچەڵەکە : مەترسە ! پیاو دەبێت شێر بێت ! سەیری خاڵۆت بکە پێم کە دەخەمە نێو ماڵ دیوارەکان لە بەردەمم دەلەرزن ! شێربە کوڕە !

تەواوی خانمەکانی ئەوێ کە چاوەڕێی شەمەندەفەریان دەکرد بە شێوەیەکی زۆر تورە لە دەوری ئەم دوانە کوبونەوە ! پیاوەکانی تریش لە ترسان هەموویان لە گۆشەیەک وەستابوون !

فەریبا ڕێک لە پشتی پیاوە کەچەڵەکەوە بوو ، پیاوەکە تازە لە ئاماژەکانی کوڕەکە تێگەشت ، بە هێواشی ڕوو دەکاتە لای فەریبا و ڕێک تا سنگی فەریبا دەبوو !

کاتێک فەریبا دەبینێت زۆر بە تورەیی سەیری دەکات و دەڵێت :

خانمی بەڕێز هەڵەم کرد !

فەریبا بە جانتاکەی بە بەهێزی دەکێشێت بە سەرە کەچەڵەکەیدا ! پیاوەکە سەری دەجوڵێنێت و ڕاستەوخۆ دەڵێ : هەقم بوو !

پیاوەکە ڕادەکات و لە دوایدا سێ چوار تاکە پێڵاوی تێدەگرن !

فەریبا و ئەوان سواری شەمەندەفەرەکە دەبن لە نێو شەمەندەفەرەکە قەرەباڵغە ، فەریبا و ئەوان بە پێوە وەستان (( لە پێشیانەوە پیاوێکیش لەسەر کورسی دانیشتبوو ))

فەریبا : من کچێک نیم کە لەماڵەوە دانیشم و خوازبێنیم بۆ بێت !

شهرە : ئەی ئەتەوێ چی بکەیت ؟

لەم کاتەدا ئەو پیاوەی کە دانیشتبوو سەیرێکی فەریبا دەکات و دەیەوێت بڵێ کە تۆ دانیشە ، بەڵام تا پیاوەکە هەڵدەستێت و فەریبا تێدەگات و دەڵێت :

زۆر سوپاس بەڕێزم مەمنون فەرموو ئێمە ئاوا ئیسراحەتین .

پیاوەکەش سەیرێکی فەریبا و ئەوان دەکات و دادەنیشێتەوە .

(( دوبارە فەریبا لەگەڵ هاوڕێکانی دەست دەکاتەوە بە قسەکردن ))

فەریبا : من خۆم دەچمە خوازبێنی !

مریم : باوکت و فەریبورز چۆن ڕازی دەکەیت ؟

فەریبا : ئەوەیان هێشتا نازانم !

شهرە : ئەگەر وتیان نەخێر ئەوکات چی ؟

فەریبا لە پێشیان ڕادەوەستم و لەسەر قسەی خۆم سوور دەبم .

(( لەم قسانەدابوون کە ئەو پیاوەکەی بەردەمیان دوبارە هەڵدەستێتەوە و فەریبا دەڵێت )) :

تکیاە فەرموو دانیشە بەڕێزم ! مافی ژن و پیاو یەکسانە ! ئێمە دەوەستین و هیچ ناڕەحەتیش نین !

پیـــاوەکە دوبـــارە دادەنیشـــێتەوە ، فەریبـــا بە هاوڕێکـــانی دەڵێـــت : نە بە ئەم ڕێزگرتنەیان نە بە ئەو ڕێزنەگرتنەیان !

مریم : من ئەوەنە غیرەتم نییە و ناتوانم بەڵام تا هەرکوێ بێت من لەگەڵت دەبم .

شهرە : منیش تا کۆتایی لەگەڵت دەبم .

لەم قسانەدادەبن دیسان پیاوەکەی بەردەمیان دەیەوێت هەستێتەوە ئەم جارەیا فەریبا بە تورەیەوە دەڵێت : برای بەڕێز مەمنون بۆ ڕێزگرتنەکەت بەڵام ئێمە دەمانەوێت هەر بە پێوە بین !

پیاوەکە ئەمجارە دێتە قسە و دەڵێت : خانمی بەڕێز وازم لێ دەهێنی یا نا ؟ من دوو وێستەگەی پێشتر دەبوو دابەزم هەر نەتهێشت !

## هەمان ڕۆژ لە ئۆفیسی کۆمپانیای بیمە

فەریبا لە ئۆفیسێک لە پشت مێزێکەوە دانیشتووە ، کارگوزارێکی هەیە کە ئۆفیسەکە پاک دەکاتەوە و سکرتێرەکەی هەندێ بەلگەنامەی هێناوە تا فەریبا واژوویان بکات ، کاتێک فەریبا واژوویان دەکات سکرتێرەکەی دەچێتە دەرەوە و کارگوزارەکە ڕوو دەکاتە فەریبا و پێکەنینێکی ماندار دەکات و فەریبا دەڵێت :

کاک حسین کەمێک خێرا ئیشەکەت تەواو بکە و بڕۆرە دەرەوە .

کاک حسین پێدەکەنێت و دەڵێت :

خانمی بەڕێوەبەر هەواڵێکی زۆر زۆر خۆش هەیە دەمەوێ پێت بڵێم !

فەریبا : چی هەواڵێک ؟

کاک حسین : هەواڵێکە کە ئەگەر بیزانیت پاداشتێکی باشم دەدەیتێ !

فەریبا : ئێ ؟

کاک حسین دەچێتە بەردەم مێزەکەی فەریبا و بە پێکەنینەوە دەڵێت :

بڕیارە شەوی هەینی ئەندازیار مهرداد بێتە خوازبێتی ئێوە !

دوبارە پێدەکەنێت و دەڵێت خانمی بەڕێوەبەر هەواڵەکە چۆن بوو ؟

فەریبا : ڕاست دەڵێیت ؟ ئێستە با منیش هەواڵێکی زۆر زۆر خۆشت بدەمێ !

کاک حسین : دەستەکانت خۆش بێت خانم گیان چییە ؟

فەریبا : ئەگەر ئەندازیار مهرداد شەوی هەینی بێتە خوازبێنی من ...

(( کاک حسین دەستی توند گرتبوون و دڵی خۆش بوو ))

فەریبا : لەجیاتی شیرینلا ، ڕۆژی شەممە بەیانیەکەی دەرکراوی !

(( لە پێش ئۆفیسەکەی فەریبا ، مریم و شهرە و ژنێکی عابا بەسەر دەیانەوێت بێنە نێو ئۆفیسەکەوە ، بە جارێک دەرگای ئۆفیسەکە دەکرێتەوە و کاک حسین ڕادەکاتە دەرەوە لە پشت سەریەوە فایلێکیش هەلدەدرێت کە ڕێک ڕوبەڕووی ژنە پیرەکە دێت ، ژنە پیرەکە خۆی دادەنەوێنێتەوە و لەسەر سەریەوە فایلەکە دەڕوات ، مریم و شهرە و پیرە ژنەکە دەڕۆنە ژوورەوە لە کاتێکدا زۆر سەریان سوڕمابوو !))

شهرە : چی بووە ؟

فەریبا : هیچ ، مژدەگانیم پێدا ، کابرای شێت !

(( دوایی چاوی بە پیرەژنەکە دەکەوێت و دەڵێت : ))

ئەم جارە چی بووە پوریّ؟ مەگەر بیمە پارەی پێ نەدایت ؟

پیرەژن : با کچم پێیان دام ، خوا خێرتان بنوسێ .

فەریبا : ئەی ئیتر بۆ هاتویت ؟

پیرەژنەکە : خوا خێریان بنوسێت زۆر زیاتریش پارەیان پێدام

فەریبا : ئێ ؟

پیرەژن : هاتووم بزانم ئەم بیمەی ئێوە سلفە دەدەن بۆ جهاز ؟ (( **جهاز : لە ئێراندا داب و نەریتە کاتێک کچ هاوسەرگیری دەکات ماڵی کچەکە سەرجەم کەل و پەلی ناوماڵ دەکڕن بۆی** )

فەریبا : بە سەلامەتی دەتانەوێت بۆ کچەکەتان جەهیزیە بکەن ؟

پیرەژن : کچم ! نا گیان ! بۆ جهازی خەمم دەوێت !

فەریبا و ئەوان توشی سەرسوڕمان دەبن و دەڵێن :

بۆ جهازی خۆت ؟؟؟

پیرەژنەکە دەڵێت : بەڵێ کچەکانم ، لەم ئاخیرەوە کە نەخۆش بووم لە نەخۆشخانە بووم چاوم بە پیاوێکی ئاقڵ کەوت و خۆشمویت ، یانی نەک ئەوەی خۆشمبوێت ها ! ئیتر دوای جعفەری خوالێخۆشبوو و ئەکبەری خوالێخۆشبوو و حەسەنی مەرحوم و ئاتەقی خوالێخۆشبوو ، ئیتر ناوی پیاو کە دەهات حاڵم تێک دەچوو ، بەلام ئیتر هەر زیندویەک ژیانێکی دەوێت !

جا بۆتان باس بکەم ، ڕۆژی کۆتایی کە ئەمویست لە نەخۆشخانە بڕۆم ، ڕۆشتم وتم بە موراد دێیت ئەم کۆتایی ژیانمانە بە یەکەوە بژین ؟ ئەویش نەیوت نەخێر ، بە هەر حاڵ خوازبێنیم لێ کرد و بەیەکەوە قەرار و شتەکانمان دانا و ڕۆژی جەژنمان دانا بۆ مارەکردن و ئەوانە ئەویش ئەو کاتە لە نەخۆشخانە دێتە دەرەوە ، ئێستەش هاتووم کە بەم بیمە پارەیەک وەربگرم بۆ جهازەکەم !

(( کاتێک ئەوەی وت فەریبا و ئەوان دەست دەکەن بە چەپڵە لێدان بۆی ))

## ماڵی فەریبا لە هۆڵی میوان

باوک و خاڵۆی فەریبا خەریکن لەگەڵ فەریبا قسە دەکەن ، باوکی تورەیە

باوکی فەریبا : کچم ، لە کۆنەوە نەریت بووە کە کچ کاتێک گەشت بە تەمەنی خۆی پێویستە شوو بکات .

فەریبا : بەڵێ باوکە گیان بەڵام چی تەمەنێک ؟ من کە هێشتا کاتی شووکردنم نەهاتووە ذ جارێ زۆر ماوە بۆ ئەو کاتە .

باوکی هاوار دەکات و دەڵێت : ئەو تەمەنەی کە تۆ ئەتەوێ شوو بکەی ئیتر کچێکی گەنج نیت ، ئەبیتە پیرەژن ، کەسیش نایەتە دااوای پیرەژن !

ڕوو دەکاتە خاڵۆی فەریبا و دەڵێت :

تۆ بۆ قسەیەک ناکەی ؟ بۆ بێدەنگی ؟ دەی تۆ شتێکی پێ بڵێ !

خاڵۆی کە زمانی تەواو نییە دەڵێ :

سسسسسەیر ببکە فەرییی

فەریبا : خاڵۆ بوو بە شەو ! دەی قسەکەت بکە

فەریبا : باوکە گیان زووە ووە

باوکی : ئەمە ڕێگەیەک کە دەبێت برۆی پێیدا ، ئیتر تا چەند زووتر بێت باشترە !

فەریبا : باوکە گیان مەگەر سەفەری ئاخیرەتە ؟ شئەمە ی بیر و بۆچونێکە کە هەتانە ؟ خاڵۆ تۆ شتێک بڵێ !

خاڵۆی ڕوو دەکاتە باوکی فەریبا و دەڵێت :

گوگوگووگوێ...

باوکی فەریبا : خالۆ من ئیشم هەیە ئەبێ بڕۆم ! خێرا بیلێ ! گوگو چییی قسیکەت بکە ئیتر

فەریبا کە دەبینێت خالۆی لە قسەکردن گیری کردووە دەڵێت : باوکە گیان با ساڵێکی تر ! ئاخر چی ئەبێت ؟

باوکی بە توڕەییەوە : هەر ئەوەی کە وتم ! ئەمشەو دەبێت ئەو خوازبێنیکەرە بێتە ئەمماڵەوە

فەریبا هاوار دەکات : نااااا نااااا

**هەر ئەو ماڵە ، قاتی سەرەوە ، ژورەکەی فەریبۆرزی برای فەریبا**

فەریبۆرز لەگەڵ هاوڕێکەی شایان خەریکن ئیش بە کۆمپیوتەر دەکەن ، شایان لە پشت کۆمپیوتەرەکەوە دانیشتووە ، فەریبۆرزیش لە تەنیشتیەوە چونەتە ناو چاتەوە .

شایان لەم کاتەدا بە فەریبۆرز دەڵێت بە چی ناوێک بچمە ژوورەوە ؟

فەریبۆرز : عەشرەت

شایان بە سەرسوڕمانەوە سەیرێکی فەریبۆرز دەکات و دەڵێت : ناوێکی تر نازانیت ؟

فەریبۆرز : با ئەیزانم ( عفەت )

شایان : ئەمە چ جۆرە ناوێکن ؟

فەریبۆرز : تۆ کارەکەت بکە ، چ ئیشت داوە ئەمانە ! برۆرە ناو چات با ببینم

فەریبۆرز : بە گیانی شایان ئەگەر من هەرچی دەڵێم نەیکەی ئیتر نە من نە تۆ !

شایان دەست دەکات بە تایپ کردن ، کەمێک دواتر لەسەر شاشەی کۆمپیوتەرەکە دیارە کەسێک وەڵام دەداتەوە و نوسیویەتی :

Hi Eshrat !! LOL

فەریبۆرز : بنوسە لول بە گۆڕی باوکت

شایانیش ئەوە دەنوسێت و دوبارە وەڵام دێتەوە :

U Vaghean Esmet Eshrate ?

دەڵێ تۆ بە ڕاستی ناوت عەشرەتە ؟

فەریبۆرز : بنوسە نا ، ناوی ڕاستیم عصمەتە ، بەڵام هەموو شوێنێ خۆم بە عەشرەت دەناسێنم !

شایان پێدەکەنێت و تایپ دەکات ، وەڵام دێتەوە و دەڵێت :

ئاخر عەشرەتیش ناوە کە لە خۆتت ناوە ؟

فەریبۆرز : کورە زیتا ناوە ؟ عەشرەت چاکە ئیتر

دوایی بە شێوەی ناز و ئەدا وەک کچان خۆی با دەدات و دەڵێت :

حەز دەکەم کە گەشتمە تەمەنی زەواج و مارەیان کردم ، کاتێک پیاوەکەم دێتە ماڵەوە و بانگم بکات ...

بە ناکاو دەنگی گەورە دەکات و وەک پیاو هاوار دەکات و دەڵێت :

عەشرەت ! عەشرەت ! لەکوێی زەعیفە ؟

دوبارە دەنگی ناسک دەکاتەوە و دەڵێت :

بەڵێ عەباس خان لێرەم :

شایان کە خەریکە سەیری فەریبۆرز دەکات و پێدەکەنێت

فەریبۆرز : ژەهری مار ! ئەوەی وتم تایپی بکە !

شایان : ئەم قسە قۆڕانە چییە ئەیڵێی ؟

فەریبۆرز : تۆ تایپی بکە

شایان : چاوەڕێ دەکات ! چی وەڵام بدەمەوە ؟

فەریبۆرز : پێی بڵێ برۆ بێ سەلیقەی ...

شایان پێدەکەنێ و سەیری شاشەی کۆمپیوتەرەکە دەکات و دوبارە پێدەکەنێت و دەڵێت : سەیر بکە چی خەبەر ! هەموو کوڕەکان ئەیانەوێت قسەت لەگەڵ بکەن !

فەریبورز : بنوسە چیتانە نەدی و بدیانە ئا ! سەرەتا سەرە بگرن و دوایی یەکە یەکە بێنە ناو چات رووم

شایان : شەرم بکە فەریبۆرز !

فەریبۆرز : لە خوا کە شاراوە نییە ، بۆ لە دروستکراوی خوا شاراوە بێت ؟

هەردوکیان پێدەکەنن

فەریبۆرز : تۆ ئەگەر دە کاتژمێر لەم چاتە بیت یەک وشەی پیاوانە نابیستیت

لە ناکاو لە خوارەوە دەنگی هاواری فەریبا دێت بەڵام فەریبۆرز هیچ گرنگی پێ نادات

شایان کەمێک بێدەنگ دەبێت و دەڵێت :

دەمگی فەریبایە !

فەریبۆرز بەو شێوەیەی کە خەریکی چاتەکەیە ئەڵێ :

هیچ نییە خەریکە قسە دەکات !

دەنگی هاواری فەریبا دیسان دێتەوە

شایان : فەریبا هاوار دەکات !

فەریبۆرز : دەنگی ئاوایە ! خەمت نەبێت

ئەمجارە دەنگی هاواری بیستەوە و شتێکیش شکا ، شایان بە دڵەڕاوکێوە دەیویست لە جێگای خۆی ەستێت وتی :

بابە لە خوارەوە شتێک بووە ! دەنگی شکانی شتێک هات

فەریبۆرز : دانیشە ئەوە مۆسیقای قیژەکانی فەریبایە !

دیسان دەنگی هاوار و قیژە هاتەوە ، لەگەڵ دەنگی شکانی چەند شتێکی تریش ، شایان بە تەواوی هەستایەوە و وتی :

تۆ چەند بێ خەیاڵی فەریبۆرز : بە دلنیایەوە فەریبا شتێکی بووە ! هەستە بڕۆینە خوارەوە بزانین چی بووە !

فەریبۆرز هەر وەک ئەوی هیچ نەبووبێت بە گاڵتەوە ئەڵێت :

ئەی بێ فەریبا بین ان شاء الله

**خوارەوە لە هۆڵی میوان**

لە نێوان فەریبا و باوکی شەڕ بەردەوامە ، دوو گوڵدان شکاوە و پارچەکانی لەسەر زەویە ، فەریبۆرز و شایان بە پەلە هاتنە خوارەوە

فەریبۆرز : چی بووە بابە ؟ دەنگتان دەگاتە کۆڵانی ئەودیو

کاتێک باوکی فەریبۆرز دەبینێت بە تووڕەییەوە دەڵێت :

هەمووی خەتای تۆ بووە

فەریبۆرز : خەتای من ؟

باوکی : من لەم شتانە تێناگەم ئەبێ ئەمشەو ئەو ماڵە بێن بۆ داخوازی

فەریبۆرز پێدەکەنێت و بە خۆشحاڵیەوە دەڵێت : بۆ من ؟ گیان لە کۆتاییدا بەختم کرایەوە ، دەستی دەدات لە یەک و دەڵێ من ڕۆشتم خۆم ئامادە بکەم

شایان و فەریبا و خاڵۆیان و کبری خانی خزمەتکاریان دەست دەکەن بە پێکەنین ، باوکیشی چەپ چەپ سەیری دەکات و دەڵێت :

ئێستە کاتی گاڵتەیە کەرە ؟

فەریبۆرز : تۆ خۆت وتت کە بڕیارە ئەمشەو بێنە خوازبێنی ! ئێستە خراپە منداڵێکی گوێگر پەیدا بووە ؟

باوکی : خەریکم ئەو کچە ئەڵێم !

فەریبۆرز : یاخوا ئەو کچە تەمەنی ئاگر بگرێ کە هەرچی بەختی منە ئەبێت بە نسیبی ئەوەوە !

دوبارە هەموویان دەست دەکەن بە پێکەنین

باوکی دەڵێت : بە ناخێری گیانت تۆ برا گەورەی ئەوی تۆ شتێکی پێ بڵێ

ەریبۆرز : خۆتان ئەوەنە نازتان پێداوە گوێ لە کەس ناگرێت

باوکی : ئەی پیاوەتیت بۆ کوێ ڕۆشتووە ؟

فەریبۆرز : ئ ..... !

ڕوو دەکاتە فەریبا و وەک هەرەشە دەست بەرز دەکاتەوە و دەڵێت :

گوێ بگرە ئەمشەو سەرت ئەخەمە لێواری ئەو باخچەوە ! ئەبێ هەر ئەمشەو شوو بکەی ! منالێشت ببێت ! منالەکەشت بخەیتە قوتابخانە ! تا سبەینێ زانکۆش تەواو بکات !

دوبارە هەموویان پێدەکەنن ، باوکی سەیرێکی دەکات و دەیەوێت بڕواتە دەرەوە

فەریبۆرز دەڵێت : بابە بابە

دوایی کە دەبینێت باوکی حسابی بۆ ناکات بە خاڵۆی ئەڵێ

خاڵۆ بانگی بکە مەهێڵە بڕوات

خاڵۆی : ڕڕڕڕڕاااااوووەسسسستتتت ...

فەریبا : خاڵۆ واز بهێنە بابە گەشتەوە ئۆفیسەکەی

فەریبۆرز بە تورەییەوە سەیری فەریبا دەکات و دەڵێت :

دیسانەوە ماڵەکەت نایەوە سەر یەک ؟

فەریبا پێدەکەنێت و سەری دەخاتە خوارەوە و هیچ ناڵێت ، فەریبۆرز دەچێت کە دانیشێت لەسەر قەنەفە ، ئاماژەیەک بە شایان دەکات کە ئەویش بچێ دانیشێت ، خاڵۆیشی بەلای پەنجەرەکەیە کە رووڵا لە حەوشەکەیە و بە حساب باوکیان بانگ دەکات و دەڵێت : ئیئیئیئی ئیشئشششی پپپێێێتتت .....

فەریبۆرز دەچێتە لای خاڵۆی و دەستی دەگرێت و لەگەڵ خۆی ئەیباتە ئەولاوە و دەڵێت :

کورە خاڵۆ وازی لێ بهێنە لە یەک چرکەدا سەر وشە ئەڵێی ئەو تێناگات

فەریبۆرز بە فەریبا ئەڵێ : سەیر بکە چی شەڕێکت نایەوە ! ئاخر تۆ چی مەرگێکتە ؟ هەموو کچێک کاتێک داواکاری نەیەت پرسە دادەنێت کەچی تۆ کاتێک داواکارت دێت پرسە دادەنێیت !

فەریبا دەست دەگرێت بە دەسم و چاویەوە و دەست بە گریان دەکات

شایان پێی ناخۆش دەبێت و سەیرێکی فەریبۆرز دەکات ، فەریبۆرزیش سەیرێکی شایان دەکات و دواتر سەیری فەریبا دەکات و دەڵێت :

دەستت بهێنە خوارەوە مردو شۆر ئەو چاوانەت نەشواتەوە ! من منیش ئاوا ئەکەی ؟

فەریبا دەستی لادەبات و دیار دەبێ کە نەگگریاوە ! دوایی دەڵێت :

کاکە ؟

فەریبۆرز : کاک و دەرد ! بۆ ڕائەبوێری ؟

فەریبا پێدەکەنێت و دەچێتە باوەشی فەریبۆرزەوە و لەسەر قەنەفەکە دادەنیشێت و دەڵێت :

کاکە توخوا کارێک بکە ! باوکم هەر واز ناهێنێ !

فەریبۆرز بە کبرا خانی خزمەتکاریان دەڵێت :

کبرا خان چەند چایەک بهێنە قورگمان وشک بوو

دوایی بە خاڵۆی ئەڵێت :

تۆش کە چای ئەخۆی ؟

خاڵۆی : ێ ێ ێ ێ ێ ێ ئاا ....

فەریبۆرز : بۆ خاڵۆ ئاولیمۆی تێبکە

فەریبا لە پاڵ گوێی فەریبۆرز هاوار دەکات و دەڵێت :

کاکە ؟!

فەریبۆرز لە جێگەی بەرز دەبێتەوە و دەڵێت :

ئا دەرد ترسام !

فەریبا : گیانی من کارێکم بۆ بکە کە باوکم جارێ واز بهێنێت

فەریبۆرز : ئەی دوایی چی ؟ گریمان ساڵێکی تریش نەتکرد ! تۆ جارێ پێم بڵێ لەگەڵ پرۆسەی هاوسەرگیری ڕازیت یا نا ؟

فەریبا : ڕازیم

فەریبۆرز : دەی پیرۆز ان شاء اللە ! تۆ هەر کەسێک هاتە خوازبێنیت شووی پێ بکە و بڕۆ !

تۆ کە ئەو دماوە لە یەک ساڵدا سێ جار توشی جەڵدەی ئەکەی ئیتر خەمی چیتە ؟

فەریبا پێدەکەنێت و دەڵێت :

کاکە هەر ئەو یەک ساڵە چۆن تەحەمول بکەم ؟

هەمویان پێدەکەنن

فەریبۆرز : سەیر بکە ! باوکم بڕیاری خۆی داوە ! ئەخلاقی باوکیشم کە ئەزانی چۆنە

فەریبا : ئاخر ...

فەریبۆرز : ئاخر بێ ئاخر ! پاریش هەر ئەم قسانەت ئەکرد ! ئیتر کەر نابم ! قسە مەکە !

فەریبا هەر ئەیەوێ شتێک بڵێ فەریبۆرز زوو دەڵێت : قسە مەکە ! قسە مەکە

شایان سەیریکیان دەکات و دەڵێت : هەر هیچ نەبێ بهێڵە کە فەریبا خان قسەکەی بکات ئەو کات تۆ ڕازی مەبە !

فەریبۆرز : ئاخر تۆ ئەمە ناناس ! ئەمە دەست بکات بە قسە کردن ، هەمموومان لێرە کەر ئەکات !

دوایی رو دەکاتە خاڵۆی و دەڵێت : دوور لە تۆ

خاڵۆی : ئائائائائائائاسسسسسا ....

فەریبۆرز هەر ئاوا سەیری دەمی خاڵۆی ئەکات و دەڵێت :

قور بە سەری ئێمە کە وەرگێڕی زمانی ڕوسیمان نییە بۆ وەرگێڕانی قسەکانی تۆ !

هەموویان پێدەکەنن و فەریبۆرز دەڵێت بە فەریبا : دەی قسە بکە بزانم چی ئەڵێی ؟

لەو کاتەدا کبرا خانیش چایەکان دێنێت

فەریبا : من لەگەڵ پرۆشەی هاوسەرگیری دژایەتیم نییە !

فەریبۆرز : یانی یەکسەر بڕۆینە سەر مارەبرین و حەفلە ؟

فەفەریبا پێدەکەنێت و تا دەیەوێت قسە بکات خالۆی دەنگی دێت : کەکەکەکەکەککەکە

سەیری کبرا خان دەکات و دەڵێت : کەکەکەکەکە

فەریبا : دیارە کەکەکەی ئەوێت بیکەنە ناو چاکەیە و تێکی بدەن !

فەریبۆرز : نا ! لەوانەیە مەبەستی کاکای بەڕازیل بێت !

خالۆی : کەکە کەوچک !

فەریبۆرز : سەیر بکە خالۆ ، ئەمە جاری سێیەم کە مەجلیسەکە تێک دەدەیت ئا !

کبرا خان دەچێت کە کەوچک بهێنێت ، فەریبۆرز کە خەریکە چایی دەخواتەوە و دەڵێت بە فەریبا : دەتفەرموو

فەریبا : مەبەستم ئەوەیە کە من نامەوێ مێرد بکەم ! ئەمەوێ مێرد بهێنم !

کاتێک ئەمە دەڵێت فەریبۆرز چایەکەی لە قورگیەوە دێتە دەرەوە و هەمووی دەکات بە خالۆیدا !

خالۆیشی کە گێژ دەبێت پیاڵە چایەکە دەکات بە شایاندا ! هەموویان بە یەکجار هەلدەستنەوە ، فەریبۆرز بە سەرسوڕمانێکی زۆرەوە دەڵێت :

چیت وت ؟

فەریبــا : بــۆچی ئــێمەی کچــان کە ئەو پەری لە نێــوان ســێ چــوار کەس یەکێــک هەڵبژێرین بەڵام کوڕ مافی هەیە کە لە نێوان ئەم هەموو کچە یەکێک هەلبژێرن ؟ کێ ئەم مافەی لە ئێمە وەرگرتووە ؟

من دەمەوێت پیاوی ژیانم خۆم هەڵیبژێرم ! بۆ نمونە بچمە بازار و ەگەر دڵم چوو بە یەکێکدا ئەوە بە دوای بکەوم و ماڵەکەیان شارەزا ببم و بچمە داخوازی ! بۆ نمـونە لە دراوسـێکانی ناونیشـانی کـوڕەکە وەرگـرم و بچـمە بەردەم مالیـان و بوەستم کاتێک هـاتە دەرەوە چاودێری بکەم و بزانم ڕەوشتی چۆنە وە ئەگەر ڕەفتاریم بە دڵ بوو ئەوە بیخوازم  یا بۆ نمونە لە هـاوڕێیەکم بپرسـم کە لە نێو شارەکەتان یا خزمەکانتان کوڕێکی باش ناناسیت کە بچمە داوای ؟

هەموویان هەر ئاوا بە بێدەنگی گوێیان بۆ فەریبا گرتووە و سەیری دەکەن

فەریبا : ئاخر چۆن پێ بڵێم کاکە ! یانی شەرمت لێ ئەکەم !

فەریبـۆرز : وەی قوربـانی خوشـکەکەم بـم کە ئەوەنە شـەرمنە ! بەڕاسـتی بـۆ مـن شــانازییە و خۆشــحالییە کە ئەوەنە تــۆ شــەرمنی ! بەڵام ســەیر بــکە ئەوەنە شەرمنیش باش نییە !

(( هەموویان دەست دەکەن بە پێکەنین کە لە ناکاو فەریبۆرز بە توڕەییەوە دەڵێت :

تۆ بە گۆڕی باوکت پێدەکەنی ؟ کە ئەتەوێ ئەم کردەوانە بڵاوبکەیتەوە ؟ ئیتر کە بمــانەوێ کەمێـک بچیـنە دەرەوە ئەبـێ بە تـرس و لەرزەوە بچیـنە دەرەوە کە نەوەک ئەو کـچەی خوازبێنیکەرمـان لە دوامـانەوە بێـت و چاودێریمـا بکـات کە بزانـێ ئایـا نەجیبیـن یـا نـانەجیبین ؟ تـا ئێسـتە لە شـەقامەکان لەگەڵ مرورەکـان چاوشارکێمان دەکرد لەمەودوا لەگەڵ کچـان ئەبێت بیکەین کە نەوەک وەسڵێک بچەسپێنن پێمانەوە ! دونیا ئاخیرە وەڵا !

ڕوو دەکاتە شایان و دەڵێت : ئیتر بەیانی کە لە مـاڵ بێیتە دەرەوە و بتەوێ بچیتە سەر ئیش کاتێک ئەتەوێ سواری تەکسیەک ببیت کچێک ئەدات بە بەردەمتدا و

تالیقێکـت لـێ ئەدات و وە ڕەخنەیەکـیش لە قەد و بـاڵات ئەگرێـت وە سـوتفە کچێکـی کـۆڵانەکەش ئەمە ئەبینێـت ! وەی چـی کارەسـاتێک ! وەک تـۆپ لەنـاو کۆڵان دەنگ دەداتەوە کە فلان کەس ئاوا بوو و جلەکانی ئاوابوو و ....!

وەی ئیتر ناتوانی لە کۆڵان سەرت بەرز بکەیتەوە ! ئەبێ شـەوان سـەیارە بهێنی و لەو کۆڵانە بار بکەیت !

هەموویـان پێـدەکەنن و خـالۆی ئەڵـێ : ئئئئئئئئئئئـااااخخخررر ففففففەەررررییییببـاا گگگییاا

فەریبۆرز زوو بە فەریبا ئەڵێ : دەربارەی گیا قسەی کرد ؟

هەمووی پێدەکەننەوە

ئەمجارە فەریبا بە جیدییەوە دڵێت :

کـاکە ئەمە ئەو قسـانەبوو کە ئەتکـرد ؟ مەگەر تـۆ خۆشـبەختی منـت نەدەویسـت ؟ مەگەر تۆ منت خۆش نەدەویست ؟ مەگەر خۆشحاڵی منت ناوێت ؟ حەز دەکەی دوای شەش مانگ لە شووکردنم بە منداڵێکەوە تەڵاق وەربگرم ؟

فەریبـۆرز : دڵیشـم وای بوێت نـابێ ! مـارەبرین و گواسـتنەوە و منـاڵبوون و تەڵاق ئەمانە هەمووی لە شەش مانگ ناکرێت !

فەریبا : کاکە !

فەریبۆرز : دەرد ، قسە هەر ئەوەیە کە باوکم وتی !

فەریبـا : باشـە کەکە ، هەرچۆنێک کە ئێوە بتانەوێت ، بەڵام وەک برایەکـی گەورە چـاوەڕێی شـتی زۆر زیـاترم لـێ دەکری ! مـن شـوو دەکەم بەڵام هەمیشـە ئەو داخە لە دڵمـدایە کە ئەمتـوانی لەگەڵ پیاوێـک هاوسـەرگیری بـکەم کە ژیـانێکی خۆشترم هەبێت ! ئەگەر بیر و بۆچونی خوێندەوارەکانمان ئـاوایە ، قـور بەسـەر

نەخوێندەوارەکان ! دایکم هەبوو ! ئەگەر ئێستە دایە زیندوو بوایە پشتگیری لێ دەکردم و نەیدەهێشت ئاوا بە زۆر بمدەن بە شوو !

هەموویـان بێـدەنگ دەب و خـاڵۆی فرێسـک لە چـاوی کـۆدەبێتەوە ، فەریبـۆرزیش نارەحەت دەبێت و دادەنیشێت و بە ئارامی ئەڵێت :

ئاخر خوشکی گیان کەمێک بیر بکەرەوە ! ئێرە ئێرانە ئێران ! ئێمە هەموومـان داب نەریتـی خۆمانمـان هەیە ، ئێمە لە سـەدەی ٢١ دایـن ئەڵێین ئەگەر ئـاو بکەی بە سەگدا زیپکە دەردەکەیـن و توشـی گەڕی ئەبـین ! ئێمە کاتێک ئەمـانەوێ ئـاوی گەرم بڕێــژین پــێش ئەوە جنەکــان خەبەر ئەکەیــنەوە تــاوەکو ئــاوە گەرمەکە نەڕێــژین بەســەریان ! ئــێمە هێشــتا زینــدانین ! زینــدانی ئەم شــتانە و هەزار خورافیاتی تریش !

ئێستە تۆ ئەتەوێ لە شوێنێکی ئاوا بکەویتە ڕێ بۆ خوازبێنی کوڕی خەڵک ؟

فەریبا : هەمشە یەکەمجارێک بوونی هەیە !

فەریبۆرز : حەتمەن ئەو یەکەمجارەش توشی ئێمەی بەدبەخت بووە !

شایان : فەریبا خان ڕاست دەکات ، ئێمە نابێت مافی هەڵبژاردنی لێ بستێنین .

فەریبۆرز : ببوەر کاکە ماندێلا ! دونیا تاریک بوو نەمدیتی !

شایان : دەرگا بکەرەوە فەریبۆرز

فەریبۆرز : دەنگی دەرگا خۆ نەهات !

دوایی هاوار دەکات : کبرا خان کبرا خان وابزانم دەنگی دەرگایە !

شایان : دەرگای قەفەسەکە ئەڵێم !

فەریبۆرز بە سەرسوڕمانەوە سەیری شایان دەکات

شایان : تۆ وەک مرۆڤێک ، ئادەمیزادێک ! ئێستە دەزانیت لەم کۆمەڵە بچوکەدا لە هەموو ئازادیەکامن بەرگری بکەی ! بۆچی کچێک لەبەر کچ بوونی لەناو خانەوادەیەک هەمیشە ئەێت لە ژێر فەرماندا بێت ؟ لە ژێر فەرمانی باوک ، برا ! ئێستە ئەم برایە ئەتوانێت لە جیاتی ئەوەی لە بەردەمی ببێتە بەربەست ، یارمەتی بدات !

فەریبۆرز کەمێ بیردەکاتەوە و دەڵێت :

گریمان من دەرگای ئەم قەفەسەم کردەوە ، ئەم باڵندەیە ناتوانێت لەم هەوا پیسەدا بفڕێت ! جێگەی لەناو قەفەس پارێزراوترە ! ئەم ئازادییە بەکەڵک نایەت !

شایان : تۆ یارمەتی بدە ، ئیتر یا ئەتوانێت سوود لە ئازادییەکە وەربگرێت یا ناتوانێت ! ئەوەیان ئیتر پەیوەستە بە خۆیەوە !

فەریبۆرز سەیرێکی شایان دەکات و دوایی پیاڵە چایەکەی هەڵدەگرێت و دەست دەکات بە خواردنەوەی فەریباش ە شێوەیەکی سەرسوڕمان بۆ ئەو بیرۆکانەی شایان سەیر دەکات ، کەمێک دواتر فەریبۆرز دەڵێت :

ئەی چی بکەم لە باوکم ؟ گریمان من قایل بوم ئەی ئەو چی ؟

شایان : تۆ ئەگەر قایل بیت ئەتوانیت هەموویان قایل بکەیت ! هەستە بڕۆ تەلەفۆنێکی بۆ بکە و با سبەی ڕۆژ ویژدانت ئازارت نەدات !

**ماڵەکەی دیکەی باوکی فەریبۆرز**

باوکی فەریبۆرز و باوەژنەکەی فەریبۆرز لە هەڵەکە دانیشتوون

باوەژن : چ عەجەب فەریبۆرز خان ! ڕێگەت ون کردووە ؟

فەریبۆرز : ەعەجەب جەماڵی تۆیە ! ڕێگەم کە زۆر لە مێژە ون کردووە !

باوکی : قسەت کرد ؟

فەریبۆرز : دەی ئەم خانمە قسەی کرد و منیش وەلامم دایەوە !

باوکی : مەبەستم فەریبایە !!

فەریبۆرز : ئەها ! بەڵێ قسەم کرد

باوکی : ڕازی بوو ؟

فەریبۆرز : بەڵێ ڕازی بوو

باوکی : دەی الحمدلله

فەریبۆرز : واتە بە بەدبەختی ڕازیمان کرد !

باوکی : دەی لە خوا بەزیاد بێت

فەریبۆرز : واتە سەرەتا ئەیوت هەرگیز ناوی مەهێنن ! دوایی کەم کەم ڕازی بوو

باوکی : دەی الحمدلله

فەریبۆرز : زۆر کەلە ڕەقە ئا ! بەڵام لە کۆتاییدا رازی بوو

باوکی : دەی الحمدالله

فەریبۆرز : واتە .....

باوکی : ئاااا ! شێتت کردم ! هەرچی بوو ڕازی بوو ئیتر

فەریبۆرز : بەڵێ ! واتە سەرەتا ....

باوکی : واز ئەهێنی یا نا ؟

فەریبۆرز : ئەمەوێ بڵێم سەرەتا ....

باوکی بە تورەییەوە ئەڵێت : بەڵێ سەرەتا کەلە ڕەق بوو و قسە قسەی خۆی بوو بەڵام دوایی ڕازی بوو ! ڕاستە ؟

فەریبۆرز : بەڵێ ڕێک وایە ، سەرەا کەلەڕەقی ئەکرد دوایی ڕازی بوو

باوکی چەپ چەپ سەیری ئەکات و باوەژنی بە هێواشی پێدەکەنێت

باوکی : دەی ئیتر ئەمشەو ئەو ماڵە بێن بۆ خوازبێنی ؟

فەریبۆرز : ئەیانەوێ بێن با بێن ، پێڵاویان سەرچاو ، دادەنیشین چایەک ئەخۆینەوە و شیرینی و میوەش ئەخۆین و بەیەکەوە قسە ئەکەین و سەرمان گەرم دەبێت ! وەڵا زۆریش باشە بەیەکەوە کۆ ئەبینەوە و چوار کەس ئەناسین و ...

باوکی : واتە چی ؟

فەریبۆرز : واتە میوان عەزیزی خوایە ئیتر !

باوکی : ئەمانە بۆ میوانە نایەن !

فەریبۆرز : ئەی بۆچی دێن ؟

باوکی بە چەپ سەیر ئەکات و ئەڵێت : دەیانەوێ بێن بۆ خوازبێنی من !

فەریبۆرز : ماشاء الله لەم قەد و بالا و ئیشتیهاتانە ! چەند جار ئەتەوێ ببیتە زاوا ؟

باوکی : ئەڵێم بێن بۆ خوازبێنی فەریبا !

فەریبۆرز : ئەمەیان ئیتر بڕواناکەم ڕازی ببێت !

باوکی : ئەی تۆی کەر بە چی رازیت کردووە کە دوو سەعات بۆم ئەڵێیت و منیش شوکری خوا ئەکەم ؟

فەریبۆرز : مرۆڤ دەبێت لە هەموو ساتێکی ژیانی شوکری خوا بکات ! گریمان دوو شوکری زیادت کرد ! ڕێگەی خوا دوور خۆ ناڕوات !

باوکی بە تورەییەوە دەڵێت : ئەڵێم ئەی بەچی ڕازیت کرد :

فەریبۆرز : دەی بەوەی کە بچینە خوازبێنی !

باوکی بە هەڵە تێدەگات و هەناسەیەکی ڕاحەت هەڵدەکێشێت و دەڵێت : دەی هەر لەسەرتاوە بتوتایە ئیتر !

فەریبۆرز دەی هەر ئەوە

باوکی : منیش هەر لە سەرەتاوە ئەوەم وت ! لە کۆتاییدا فەریبا ڕازی بوو کە بێنە خوازبێنی !

فەریبۆرز : بەڵێ تۆ ڕاست دەفەرمویت ، ڕستەکە تەقریبەن تەواوە بەس یەک وشە فەرق ئەکات !

باوکی : واتە چی ؟

فەریبۆرز : واتە فەریبا ڕازی بوو کە بچێتە خوازبێنی !

باوکی : بێنە خوازبێنی ؟

فەریبۆرز : بچێتە خوازبێنی

باوکی : بێن ؟

فەریبۆرز : بڕوات !

باوکی بە ئارامی ئەڵێ : بێن ؟

فەریبۆرز : بڕوات

باوکی هاوار ئەکات : ئەڵێم بێن ؟

فەریبۆرز : بڕوات

باوەژن : ئەوەنە هەڵمەچۆ ! بۆ دڵت باش نییە

فەریبۆرز : دەی ڕاست دەکات ئەوەنە هات و هاوار ئەکەی کە دڵت ناڕەحەت ئەبێت

باوەژن پەرداخێک ئاو دەدات بە باوکی فەریبۆرز و ئەویش کەمێک دەخوات و دوایی دەڵێت :

مرۆڤ دوو سەعات لەگەڵ ئەم کوڕە قسە بکات دوو ڕستەی لێ وەرناگرێت ! کوڕی خۆم یەک وشەی جوان ئەڵێم تۆش بە جوانی وەڵامم بدەرەوە

فەریبا ڕازی بوو کە ئەمانە بێنە خوازبێنی یا نا ؟

فەریبۆرز : نا

باوکی : واتە چی ؟

فەریبۆرز : بابە فەریبا ئەیەوێت خۆی بچێتە خوازبێنی ! هەر ئەوەنە

باوکی کەمێک بێدەنگ دەبێت و دواتر بە ئارامی ئەڵێت :

واتە .....

فەریبۆرز : واتە فەریبا وەک پیاوێک هەڵدەستێت و جلی جوان لەبەر ئەکات و لەگەڵ بەڕێزتان و خاڵۆ و من ، تەشریف ئەبەین و ئەچین بۆ خوازبێنی کوڕێکی قۆز .

باوکی خەریکە لە ناو مێشکی ئەم شتانە شی ئەکاتەوە ساتێک دوای ئەوە بە ئارامی ئەڵێت :

واتە ئێمە لەگەڵ یەکتر هەستین و بچینە خوازبێنی کوڕان ؟

فەریبۆرز : بەڵێ بەڵام نەک هەموو کوڕێک ، بەڵکو کوڕێکی قۆز و باش و نەجیب !

باوکی دیسان بە ئارامی ئەڵێ : گوڵ و شیرینی بگرین بە دەستمانەوە و بچینە خوازبێنی کوڕان ؟

فەریبۆرز : گوڵ و شیرینی ئەکڕین ، زۆریش باشە ئەسڵەن باش بوو کە وتت لەوانەبوو لەیادمان بکردایە و بە دەستی بەتاڵ بچوینایە

لە ناکاو باوکی دێتەوە هۆشی خۆی و مێز و هەرچی لە بەردەمیدایە فڕێی دەدات و دوایی بە تورەیەکی زۆرەوە سەیری فەریبۆرز دەکات و دوایی بەڕێ ئەکەوێت کە بچێت بۆ ژورەکەی خۆی ، تا ئەیەوێ بڕوات فەریبۆرز بانگی دەکات و ئەڵێت :

نەتوت بەڕێزیشت تەشریف دەهێنن یا نا ؟

باوکی ڕووی تێ دەکات و دەڵێ : دەمت داخە حەیوان

باوەژن مێزەکەی چاک کردەوە و هەرچی ڕژابوو لەسەر زەوی کۆی کردەوە و هەموو شتێکی ڕێک و پێ: کردەوە فەریبۆرزیش بە هێواشی لەسەر قەنەفەکان دانیش کاتێک ئیشەکانی تەواو بوون ، فەریبۆرز لە شوێنەکەی هەستا و وتی لەسەر ئیزنتان با من بڕۆم

باوەژن : ببورە کە ئاوا خراپ بوو دۆخەکە

فەریبۆرز : بۆ ئێوە باش بێت ، خراپیەکەی بۆ ئێمە ! لەسەر ئیزنت

باوەژن : یەک خولەک دانیشە ئیشم پێتە

فەریبۆرز : نا ئیتر با بڕۆم

باوەژن : تکا دەکەم دانیشە

فەریبۆرز دانیشت و باوەژنی چایەکی بۆ هێنا و دوایی جگەرەیەکی پێشکەش کرد

فەریبۆرز : ناکێشم

باوەژن : باوکت دەزانێت کە دەکێشی

فەریبۆرز : لەپێش باوکم نایکێشم

باوەژن : خۆ ئێستە باوکت لێرە نییە

فەریبـۆرز جـگەرەکە هەڵـدەگرێت و بە چەرخەکەی خـۆی جـگەرەی بـاوەژنەکەی دادەگیرسێنێت پاشان ئەوەی خۆشی دادەگیرسێنێت ، باوەژنەکەشی دادەنیشـێت و دەڵێت :

کرا جارێک گۆشەیەکی ئەم ژیانەتان بدەن بە من ؟

فەریبۆرز : ئێوە لە گۆشەیەک بوون

باوەژن : ئەو گۆشە ناڵێم ، گۆشەیەکی باری ژیان ئەڵێم

فەریبۆرز : هەر ئەم ماوە کەمە کە لام بویت تاونیت گۆشەیەک بگریت

باوەژن : ئێوە هەر حسابتان بۆ نەکردم

فەریبۆرز دوکەڵی جگەرەکەی دەداتە دەرەوە و دەڵێت : لە حساب و کتاب نازانین

باوەژن : ئەگەر حساب و کتابتان بزانیایە لەم کاتانەدا بە کەڵکتان دەهات !

فەریبۆرز : ئەیەوێ ببێتە نمونە ! فەریبا زۆر ئینکارە لەوەی کە بیری لێ ئەکەیتەوە

باوەژن : کرا جارێک ئیشێک بکەن و منیش کەمێ هەست بە دلنیـایی بکەم ؟ منـیش ژنێک بووم بەبێ حەقی هەڵبژاردن ذ بەبێ پشتیوان بەبێ ئەمنیەت ! لەگەڵ دوو سێ ڕکابەری بەهێزی وەک ئێوە !

فەریبـۆرز سـەیرێکی دەکـات و بـاوەژنی شـەکردانەکە دەهێنێـتە بەردەمـی و زەردەخەنەیەک دەکات و دەڵێت

من لە جێگەی دایکی ئێوەم

فەریبـۆرز شـەکرێک هەڵـدەگرێت و دەڵێت : هیچمـان لە تـۆ نەبینـی کە ئیشـێکت بـۆ بکەین

باوەژن : هەر ئەوی کە ئەم باوەکە تورەتان بۆ ئەگرمە خۆم بەس نییە ؟

فەریبۆرز : نییەت !

کەمێک دەوستێت و دەڵێت ئێستە کاتی ئەوەیە نیەتتان دەربخەن !

باوەژن : ئەو کاتە گۆشەیەک دەبێتە هی من ؟

فەریبۆرز : دڵی ئێمە زۆر گەورەیە پڕە لە کێشە ! گۆشەی زۆری هەیە !

دوایی زەردەخەنەیەک دەکات و سەری دەخاتە خوارەوە و پیاڵە چایەکەی هەڵدەگرێت ، دوای ساتێکی کەم دەنگی کردنەوە و داخستنی دەرگاکە دێت ، باوەژن ڕۆشتووەبۆ ژورەکەی باوکی فەریبۆرز کە قسەی لەگەڵ بکات و ڕازی بکات

فەریبۆرز خۆشحاڵە ، خەریکە خواحافیزی دەکات و دەڕوات ، باوکی باوەژنی لە بەردەم دەرگا وەستاون

باوکی : بەڵام لەیادت نەچێ ! تەنها یەک هەفتە ! هەر ئەوەنە

فەریبۆرز سەرێک دەلەقێنێت و دوایی سەیرێکی باوەژنی دەکات و پێی پێ دەکەنێت ، ئەویش پێی پێ دەکەنێت و دەڵێت :

گۆشەیەک بۆ من ؟

فەریبۆرز : بۆ تۆ

دوایی هەردوکیان پێ دەکەنن

باوکی : گۆشە ئیتر چییە ؟

فەریبۆرز : هیچ ، گۆشەی کارێک ئەڵێم

## ماڵی فەریبا و ئەوان لە ناو هۆڵی میوان

فەریبا و شایان و خاڵۆی دانیشتوون ، فەریبۆرز خەریکە لەبەردەم خۆیەوە شیعر دەڵێت لە ڕێڕەوەکە دێتە ناو هۆڵەکە وە دێتە ڕووبەڕووی ئەوانی تر و هەر خەریکی شیعرە

شایان : چی بوو ؟

فەریبۆرز بە ئارامی ئەچێتە شوێنێک و دادەنیشێت و دوو جگەرە دەردەهێنێت و دایدەگیرسێنێت

هەرگیز بیرم نەدەکردەوە ئەوەنە باوکم بەڕێز بێت

فەریبا بە سەرسورمانەوە دەڵێت :

چی وت کاکە ؟

فەریبۆرز : کاتێک قسەکانم پێ وت تەنها وتی بێدەنگ بە کەرە وایی ڕۆشت ! زۆرە ها ! کە باوکێک ئاوا بە ڕاحەتی و دۆستانە لەگەڵ کوڕەکەی پەیوەندی دروست کات !

شایان : تەنها ئەوی وت ؟

فەریبۆرز : نا ، شتی جوانی تریشی هەبوو کە ئەیویست بڵێت بەڵام نەیوت !بێدەنگیەکانی زیاتر پەیام بوون بۆم ! واتە پەیامەکەی بە من دەگەیاند بەڵام خوا باوکی سپێدە خان بە ڕەحمەت بکات کە هێشتی باوکم لە تەنهاییدا ئەو قسانەم پێ بڵێت !

شایان : لە کۆتاییدا چی بوو ؟

فەریبۆرز زەردەخەنەیەک دەکات و دەڵێت :

ئەتەوێ تەواوی وەڵامەکە ببیستیت ؟ ڕاکە ئێستە هەر ئێستە لەسەر خۆیەتی تەلەفۆنی بۆ بکە !

شایان : خۆت بێتام مەکە ئیتر !

فەریبۆرز: کورە هیچ نەبوو ! سەرەتا لە قسەکانیان پێش بڕیار سڵاویان کرد لە تەواوی خێزانەکەم پاشان لە بڕیارەکەدا وتی تەنها یەک هەفتە مۆڵەتتان هەیە !

لەو یەک هەفتەیە دەبێ زاوایەکیان پێ بناسێنین !

دوای کەمێک بێدەنگی شایان دەڵێت : هیچی تریان نەوت ؟

فەریبۆرز سەیرێکی دەکات و پێدەکەنێت و دەڵێت :

گوێت بێنە با پێت بڵێم کە چی دیکەیان دەوت

شایان بە لاچاوێک سەیری دەکات و فەریبا دەڵێت : هەفتەیەک زۆر کەمە !

فەریبۆرز : بڕیارەکە شایەنی گۆڕین نییە

فەریبا : لە هەفتەیەکدا من چی بکەم کاکە ؟

فەریبۆرز کە خەریکە جگەرەکەی دەکوژێنێتەوە دەڵێت :

وەڵا بارودۆخ لەگەڵ بارودۆخ جیاوازی هەیە ! ئەگەر شتێکی وا بۆ من پێش بهاتایە من هەر ئێستە هەڵدەستامەوە و دەچومە بەردەم یەکێک لەم زانکۆ و پەیمانگایانە لە نهۆمی کچان لە بەینی دوو سەد سێسەد کچ دانەیەکی شیرین و کامڵم هەڵدەبژارد و سواری سەیارەم دەکرد و دەمخستە ناو پاکەتێک و ئەهاتمەوە لەماڵەوە پێشکەشم دەکردن بەڵام بارودۆخی تۆ جیاوازە من دەتوانم کچێکی زانکۆ بهێنم بەڵام تۆ ناتوانی کوڕێکی زانکۆ بهێنی چونکە تەمەنی بۆ زەواج ناشێت !

فەریبا کەمێ بێدەنگ دەبێت و پاشان دەڵێ : من هەرگیز بیرم لەم کاتە کەمە نەکردبوویەوە

فەریبۆرز : بینیت ئێستا ئەگەر دەرگای قەفەسەکەش بکەیتەوە ناتوانی لەم هەوا ئازادە بفڕیت ؟

شایان : تۆ ئەگەر بتەوێ ئەکرێت !

فەریبۆرز : شتێکت پێ ئەڵێم کە هەم ئەلفت بێ هەر نون !!؟

شایان : بەڕاست هیچ بیرۆکەیەکت نییە ؟

فەریبۆرز : بیرۆکەم هەیە بەڵام کەمێ قورسە !

فەریبا : تۆ تەنها بیڵێ کاکە

فەریبۆرز : ئەمڕۆ یاری تۆپانێیە چۆن بچین بلیت بکڕین و بچین بۆ یاریگای ئازادی ؟

لەوێ دەتوانی لە بەینی سەد هەزار کەس دەستی یەکێ بگری و ببیتە ژنی ، واتە پیاو بهێنی ! هەڵبژاردەن لەمە باشتر نابێت ! لە نێوان سەد هەزار کەس ! وەڵا کە پیاویشین شوێنێکی وا باش نییە بۆمان .

شایان و خاڵۆ دەست دەکەن بە پێکەنین ، فەریبا بیردەکاتەوە و دەڵێت : خۆ خراپیش ناڵێیت ! گریمان پەنجا شەست هەزاری بارودۆخیان گونجاو نەبێت خۆ ٤٠ هەزار دەمێنێتەوە خراپ نییە !

هەموویان سەیری فەریبا دەکەن کە هێشتا بیری لێ دەکاتەوە و فەریبۆرز دەڵێت : سەیری ئەو ڕووی ! ٤٠ هەزار کەس هێشتا تازە ئەڵێی خراپ نییە ؟؟!!!!

فەریبا : نا نا ! واتە باشە

فەریبۆرز : هەڵەم کرد ! تا دە ڕۆژی تر هیچ یاریەک ناکرێـ مەگەر ئەوەی بچین بۆلای سەرۆکی یەکێتی تۆپی پێ و داوای لێ بکەین لەبەر خاتری ئێمە لەم هەفتەیە یاریەک ڕێک بخات !

فەریبا کە هەر خەریکی بیرکردنەوەیە دەڵێت : ئەی یاری باسکە ؟ ئەویش لەم هەفتە ناکرێـ ت؟

فەریبۆرز : نا ئەو سودی نییە ، ئاخر ئاخری کە یاریگاکەش پڕ ببێت ئینجا دوو هەزار کەس دەگرێت ، یاری باسکە زۆر هاندەری نییە ، دەبێ بیرێکی تر بکەینەوە

دواتر سەیرێکی فەریبا دەکات و دەڵێت : کچێ قسەکەی منت بە جیدی وەرگرتووە ؟

وەڵا هەر ئەوە ماوە بچین لە بەینی هاندەرەکاندا بگەڕێین بۆ پیاو !

دواتر لە ناکاو دەڵێت : ئەها دۆزیمەوە !

هەموویان پێکەوە دەڵێن چی ؟؟

فەریبۆرز : ڕیکلامێکم بینی لە ڕۆژنامە بۆ ئەکتەری ! دەڵێین بۆ نمونە پێویستمان بە ئەکتەرێکی قۆز و بەژن ڕێک هەیە کە لەبەردەم خانمێک ڕۆڵ ببینێت ! چۆنە ؟!

## شەو لەسەر بانی ماڵی فەریبا

فەریبا دەچێتە تەنیشت سەربانەکەی تر و چەند فیکەیەک بە شێوەی ڕەمز لێدەدات و کەمێ دواتر دەنگی پێ دێت و دواتر شەهرە بە دیار دەکەوێت تا ئەگات و دەڵێت : چەنێ تاخیر بوی ! لەکۆتاییدا چی بوو ؟

فەریبا بە ئارامی پێدەکەنێ و بە دەستەکانی هێمای ( V ) سەرکەوتن نیشان دەدات ، هاوڕێکەی هورایەک دەڵێت و دەڵێ با بچم مریەمیش بانگ بکەم !

خێرا دەڕواتە سەربانەکەی دیکە و چەند بەردێک هەڵدەداتە حەوشەکەیان و کەمێ دواتر مەریەم بەدیار دەکەوێت دواتر قیژەیەکی دڵخۆشی دێت و شەهرە و مریم دەچنە سەربانی ماڵی فەریبا و تا دەگەن بە دڵخۆشییەوە بە فەریبا دەڵێن : چۆن فریوت دان  و ڕازیت کردن ؟

فەریبا : فریم نەدان ! واتە کاکم فریو ناخوات زۆر زیرەکە !

شهرە : ئەی چیت لێکرد ؟

فەریبا : کەرم کرد !

هەرسێکیان دەست دەکەنە پێکەنین و پاش کەمێک شهرە دەڵێت :

ئێستا تۆ دڵنیایت کە ئەم کارە دروستە ؟

فەریبا : هەرکەس هەرکات حەق و مافی بەکاربهێنێ دروستە !

شهرە : واتە دەڵێم دواتر بۆت خراپ نەبێت !

فەریبا : من ئیشێکی خراپ نامەوێ کەم تەنها دەمەوێ خۆم هاوسەرەکەم هەڵبژێرم !

سەیر بکە ! خوا ئێمەی بە ئازادی دروست کردووە ! ئێوە پێم بڵێن جیاوازی ئێمە و گوێدرێژێک چییە ؟

مرسم و شهرە کەمێ بیردەکەنەوە

مریم : گوێیان درێژە

شهرە : کلکیشیان هەیە

فەریبا : ون بن ! خەریکم بە جیدی قسە دەکەم ! جیاوازی ئێمە و ئەوان ئەقڵمانە ! من تەنها لەدایک بوونم بە ویست و هەڵبژاردنی خۆم نەبووە ! شتەکانی دیکە خۆم هەڵمبژاردوون شیرم خوارد چونکە بۆم باش بوو ئەگەر خراپ بوایە نەمدەخوارد ، نانم خوارد ئەگەر خراپ بوایە نەمدەخوارد ، یاریم کرد ، دەرسم خوێند ، چومە زانکۆ ، گەشتم کرد ،. گوێم لە میوزیک گرت ، شاد بووم ، هەموو ئەمانەم کرد چونکە پێم باش بوون ، هەموویش بە هەڵبژاردنی خۆم بوون ، ئێستە چی هۆکارێک و چی مانایەکی هەیە بە هەڵبژاردنی کەسێکی دیکە هاوسەرگیری بکەم ؟ ئەم دانەش دەتوانم خۆم هەڵیبژێرم !

دواتەر دەڵێت : تەنها دەترسم کە نەوەک بیرم لە هەموو لایەنەکان نەکردبێتەوە ! بەڵام دەی ، کاتەکە کەمە ! ئێستە بەم زانیاری و شتە کەمانە دەست پێ دەکەین

نەخشەکان !

مریەم ڕاستەوخۆ سێ چوار نەخشەی گەورەی لول کراو لەسەربانەکە دەهێنێت و دەیانکاتەوە و چەند بەردێک دەخاتە سەریان و دەڵێت :

هەموو نەخشەکان ١٠٠٠/١ لە هەزار یەکە ، لە ناویدا وردەکاری دەقیقی تێدایە ، شوێن ، بەشی ڕۆژئاوا ، شەقامی فریشتە ، زەعفەرانیە و فەرمانیە ، ئەو ماڵانەی کە بە ( X ) ی سوور دیاری کراون لە پلەی یەکەمن ، ئەوانەی بە ڕەنگی سەوز دیاری کراون بۆ قۆناغی دووەم .

دانیشتوانی هەر ماڵێک بە خاڵ دەستنیشان کراون ، خاڵی پرتەقاڵی نیشانەیە بۆ دایک و باوکەکان ، خاڵی زەرد کچی ماڵەوە ، خاڵی وەنەوشەیی کوڕی ماڵەوە .

فەریبا : ئێمە کاتی زۆرمان نییە ! تەنها یەک هەفتە مۆڵەتمان هەیە .

مریەم : شایەنی گۆڕین نییە ؟

فەریبا : نەخێر باوەڕ ناکەم ، دەبێ ئامانجەکان گوڵبژێر بکەین

شهرە : پێشتر ئەنجامامان داوە

لاپتۆپێک دەهێنێت و دەڵێت :

کەسی یەکەم : شەقامی فریشتە

ناو : سهیل

نازناو : تیموری

تەمەن : ٣٠ ساڵ

ئاستی خوێندن : بەکالۆریۆس

شوێنی کار : کارگەی باوکی

تاقانەیە

فەریبا : لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە ؟

شـەرە : بەڵـێ چـات ناکـات لەگەڵ کچـان ، تەلەفـۆنی نەناسـراو وەڵام نـاداتەوە ، کوڕێکی زۆر باشە من کە چاوم گرتویەتی

فەریبا وەک کوڕێک دەڵێت : گیانی شهرە ئەگەر زۆر چاوت گرتویەتی با من وازی لێ بهێنم !

شهرە : نا تۆ نەمری ! پیرۆزت بێت ، پێشکەشە بە خۆت !

فەریبا : ئەڵێم ئەسڵەن وەرە تۆ بیهێنە ، بێ تەعارف دەڵێم بەخوا !

شـهرە : فیدای مەرامت بـم ة تـۆ بیهێنە وەک ئەوەیە مـن هێنـابێتم ، چـی جیـاوازی هەیە ؟

هەرسێکیان پێدەکەنن و فەریبا دەڵێت : کاتژمێرەکانتان ڕێک بکەن ، کاتژمێر ١٠:١٥ هەمویان ڕێکی دەکەن .

فەریبا / چالاکیەکەی سبەینێ کاتژمێر ٨ی بەیانی دەست پێ دەکات

پاشان دەستی دەهێنێتە پێشەوە و دەڵێ بە هیوای سەرکەوتن

(( هەموویان دەستیان دەخەنە سەر یەک ))

**بەیانیەکەی لە ناو سەیارەیەکی بیجۆ ( پژۆ )**

شـــهرە ســـەیارەکە لێـــدەخوڕێت و فەریبـــا لە پێشـــەوە و مەریەمـــیش لە دواوە دانیشتوون

فەریبا : لابدە !

شهرە سەیارەکە دەباتە لای ڕاست و ڕایدەگرێت ، کوڕێک لە شـەقامەکە وەسـتاوە و چاوەڕێی تەکسییە ، فەریبا ئیشارەت بۆ کوڕەکە ئەکات و دەڵێت :

چۆنە کچینە ؟

مریم : خراپ نییە

فەریبا : برۆ پێشەوە با سواری بکەین

شهرە دەست بە ڕۆشتن دەکات و دەچێتە بەردەم کوڕەکە و دەوەستێت و فەریبا جاکەکە دەهێنێتە خوارەوە و بە کوڕەکە دەڵێت : بۆ کوێ دەڕۆیت با بتگەیەنین

کوڕەکە سەری دەسوڕمێ و دەڵێت :

زۆر سوپاس عەزیەتتان نادەم

فەریبا : عەزیەتی چی ، فەرموو تکا دەکەم !

کوڕەکەش کە دوودڵی پێوە دیارە دەڵێ : زۆر سوپاس بەس بڕوا ناکە شوێنمان لەیەکەوە نزیک بێت

مریم :بە پێچەوانەوە ، ئێمەش بۆ ئەو شوێنە دەچین کە تۆ دەچیت

فەریبا : بەڕێزم مەترسە ئێمە تەنها دەمانەوێ هاوکاریت بکەین

کاتێک فەریبا ئەڵێ مەترسە ، دیارە کوڕەکە پێی ناخۆش دەبێت ، بە تەکلیف لە دواوە سەردەکەوێت ، شهرە دەرگای سەیارەکە قوفڵ دەکات ، کوڕەکە دەترسێت بەڵام هیچ ناڵێ

شهرە دەست دەکات بە ڕۆشتن و فەریبا بە کوڕەکە دەڵێت :

ببورە تەمەنت چەندە ؟

کوڕەکە سترێسی هەیە ، فەریبا ڕووی کردوەتە دواوە ، مەریەمیش لە تەهیشتیەوە سەیری دەکات ، شهرەش لە ئاوێنەکەوە !

کوڕەکە : ٢٩ ساڵ

مریم به هێواشی سەری بەرز و نزم دەکات و دەڵێ :

ماشاء الله ، ماشاء الله ببورە هاوسەرگیریت کردووە ؟

کوڕەکە : نەخێر ، بەڵام کەم کەم بیری لێ دەکەمەوە

ئەمجارە فەریبا وەک مریم سەری بەرز و نزم دەکات و دەڵێ : ان شاء الله ان شاء الله

شهرە : لەگەڵ دایک و باوکت دەژیت ؟

کوڕەکە : بەڵێ خانم

کوڕەکە تەواو دەترسێت و بە دڵەڕاوکێوە دەڵێت : ببورن ئێوە خفاشی شەو* نین ؟

* خفاش شەو / نازانوی قاتڵێکی ئێران بو کە چەندین ئافرەتی کوشتبوو

هەرسێکیان بە حاڵەتی نەخێر سەریان دەجوڵێنن

کوڕەکە : لەو خانمانەن کە کوڕ دەبەن و دڵ و گورچیلەی دەردەهێنن و دەیفرۆشن ؟

دیسانەوە بە زەردەخەنەوە دەڵێن نەخێر

کوڕەکە ئیتر گریان دەیگرێ و دەڵێ : ئەی چیتان لە من دەوێت ؟

فەریبا : دەمانەوێ بتگەیەنینە جێگەکەت کوڕە گیان مەترسە !

کوڕەکە : بەخوا من لەو جۆرانە نیم !

فەریبا : دەزانین کە نیت ، تەنها دەمانەوێ کەمێ قسە بکەین ، بە مەرجێک ڕاست بڵێیت !

کوڕەکە : بەسەرچاو خاتوون

فەریبا : تۆ ئەگەر هاوسەرگیری بکەیت ، خیانەت لە هاوسەرت دەکەیت ؟

کوڕەکە : گوو دەخۆم خاتوون گیان

کچەکان پێکەوە دەڵێن : ئافەرین ئافەرین

فەریبا : تۆ ئەگەر ڕۆژێک هاوسەرگیری بکەیت بە زۆر کاری پێ دەکەیت ؟

کوڕەکە : من هەڵە دەکەم خاتوون گیان

کچەکان : باریک الله باریک الله

فەریبا : سەیر بکە ئەزیزم تۆ بیر دەکەیەوە ئەگەر کچێک بێتە خوازبێنیت کارێکی خراپی کردووە ؟

کوڕەکە : من بە گۆڕی باوکم پێ ئەکەنم کە بەو شێوە بیر بکەمەوە ! ئەسڵەن مایەی شانازییە بۆ من !

دیسان کچەکان دەڵێن : باریک الله باریک الله

فەریبا : نا ، باشە

شهرە : بەڵێ منیش پەسەندم کرد

مریم کە بە چاوی مشتەریەوە سەیری کوڕەکە دەکات دەڵێت : کوڕێکی زۆر باشە

فەریبا بە مەریم دەڵێت : ئەتەوێ تۆ ئەم دانەیان ببە ، من دەچم بۆ دانەیەکی تر

کوڕەکە حەپەساوە و بە چاوی گریانەوە دەڵێ بە مریم : بڕیارە ئێوە من ببەن ؟

مریم تەنها زەردەخەنەیەکی بۆ دەکات کە کورەکە دەست بە گریان دەکات و دەڵێت :

بە قورئان من پارە پەیدا دەکەم بۆ دایک و باوکم و دوو خوشکەکەم ، بچن لە گەرەکەکەمان بپرسن دیوارەکان قسەدەکەن من قسە ناکەم ، من تا ئێستا لە

گەڕەکەکەمـان سـەرم بەرز نەکـردووەتەوە ، یەک کەس گلەیـی لە مـن نیـیە ، توخوا م مەبەن ، من ئەسڵەن بە کەڵکی ئێوە نـایەم ، بەڵام هـاوڕێیەکم هەیە کە بەکەڵکی ئێوە دێت ، ئەگەر بهێڵن بڕۆم هەر شوێنێک ویسـتتان بۆتـانی دەهێنم ، من ئەگەر یەک کاتژمێر درەنگ بکەوم دایکم جەڵدە لێی دەدات .

لەم کـاتەدا دەگەنە ترافیـک لایتێـک کە سـوورە کە دەوەسـتێت کـوڕەکە قـوفڵی سەیارەکە دەکاتەوە و خۆی هەڵدەداتە خوارەوە ، هاوار دەکات و دەڵێ : مەگەر ئێوە برا و باوکتان نییە ؟ مەگەر ئێوە ناموستان نییە کە کەونە شوێن ناموسـی خەڵکی ؟ ئەی هاوار خەڵکیتە بپرسن !

لەو کـاتەدا دوو سـێ کـوڕی گەنـج دێنە لای لێـی دەپرسـن چـی بـووە ؟ چیـان لـێ کردویت ؟

ئەزیەتیان داویت ؟

کوڕەکە بە هاوار و گریانەوە دەڵێت :

بە زۆر منیان دانیشاند لە سەیارەکە و لەلای گوێم هەر چپ چپیان بوو !

یەکێ لە کوڕکان بە هێواشی لەلای گوێی شتێکی پێ دەڵێت کە کوڕەکەش بە هێواش وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ نا الحمدلله خێرا خۆم هەڵدایە خوارەوە !

دواتر دەست دەکات بە گریان و کوڕەکانیش دەڵێن ئاخر چیان لێ ویستویت ؟

کـــورەکە : بە بیـــانوی ئەوەی بمگەیەنـــنە شـــوێنێک ســـواریان کـــردم و داوای هاوسەرگیرییان لێ کردم !

کوڕەکان سەیری دەکەون سەیری کچەکانیش دەکەن و ڕادەکەنە بەردەم سـەیارەکە و دەوەستن وەک موسافیر ڕادەوەستن و دەڵێن :

ڕاستـەوخۆ دەچـن ؟ ببـورن تـا ئەم فـولکە دەچـن ؟ ببـورن قـاچم ئـێش ئەکـات تـا ئەو کۆڵانە دەمگەیەنن ؟

شهرەش پێ دەنێ بە بەنزیندا و بۆی دەردەچن ...

**لە ناو پارکێک**

فەریبا و شهرە و مریم خەریکن لەگەڵ یەک قسە دەکەن و لەسەر کورسیەک دانیشتوون ، بەرامبەر فەریبا کەمێ لەولاتر کوڕێکی گەنج دانیشتووە بەڵام پشتی لە فەریبا و ئەوانە ، فەریبا بەو شێوەی کە خەریکی قسەکردنە جار جاریش سەیری کوڕەکە دەکات

فەریبا : هەرسێکمان ئەو کوڕە داماوەمان سەرخست و لێکۆڵینەوەمان لەگەڵ کرد دەی دیارە کە داوە دەترسێت !

شهرە : ئەو جۆرە کوڕانە کاتێ بەیەکەوە بن مل قایمن بەڵام کە بە تەنها بوون لە مشک ترسنۆکترن

فەریبا دوبارە سەیری کوڕەکەی بەرامبەر دەکاتەوەکە لە ناکاو دوو کچ بە بەردەمیاندا تێپەڕ دەبن بەڵام کوڕەکە هەر سەریش بەرز ناکاتەوە سەیریان بکات

فەریبا : ئێمە کە نەهاتووین بیانترسێنین

مریم : کچنە کەیسە ئەسڵیەکە ! درەنگ نەکات !

شهرە : نا هێشتا کاتمان هەیە

فەریبا : کچینە ئەو کوڕەی بەرامبەر چۆنە ؟

لەو کاتەوەی هاتووین خەریکم چاودێری ئەکەم کچ بە بەردەمیان دەڕوات هەر سەیریان ناکات !

مریم : باشە ئەمجارە خۆت بە تەنها یی بڕۆ قسەی لەگەڵ بکە

فەریبا : سەرەتا دڵنیا ببنەوە بزانن بارودۆخی لەگەڵ ئێمە گونجاوە ؟

لەو کاتەدا سوتفە کوڕەکە هەڵدەستێتەوە و دادەنیشێتەوە

شهره : لەشولاری لەسەر ٢٠/١٩

فەریبا : چاوتیژی و سەیرکردنی ئەملاو ئەولا و سەرسوڕاندن و ساختەچێتی ٢٠/٢٠

مریم : قورسی و شەخسیات ٢٠

شهره : پیاوەتی ٢٠

مریم : بە گشتی لەگەڵ مەرجەکات دەگونجێت

فەریبا هەڵدەستێتەوە و دەچێتە پێش کوڕەکە و دەڵێ : ببورە بەڕێزم

کوڕەکە تا سەری دەسوڕێنێت بەرەو ڕووی فەریبا ، فەریبا دەبینێت

( میکیاجی کامل ، ڕیمێڵ و ژێر چاو ، سوراو و سەرگۆنا ، ژێر برۆشی کردووە ، تا سەیری فەریبا ئەکات وەک کچێک بە فەریبا ئەڵێ : ناسکە گیان فەرموو !

فەریباش ڕێک دەگەڕێتەوە

**هەمان ڕۆژ – لە کۆڵانێکی باکوری شار**

فەریبا و شهره و مریم لە ناو سەیارەکە دانیشتوون

فەریبا : ئەم دانەیان نابێ بیترسێنین و ڕاوی بنێین ، دەبێ چالاکیەکە زۆر ڕێک بێت . بارودۆخ ڕابگەیەنن

کە ئەمە ئەڵێ مریم دادەبەزێت و دەڕوات بۆ بەردەم ماڵی کوڕەکە و چاوەڕێ دەکات

فەریبا : کاتژمێری چونە دەرەوە ؟

شهره : ١١ی پێش نیوەڕۆ

( مۆبایلی شهره جەرەس لێ دەدات )

شهره : گوێم لێیە

مریم : ئامانجەکە خەریکە لە ماڵ دێتە دەرەوە

شهره : بیستم تەواو

ئەویش بە فەریبا دەڵێ کابرا لە ماڵ دەرچوو

(( کوڕێک کە جانتایەکی پێیە لەسەر شوستەکە خەریکی ڕۆشتنە ، چەند هەنگاوێک دوای ئەو فەریبا چاودێری دەکات ، لە پشت فەریباش شهرە بە دواوەیەتی ، مریەمیش لەوسەرەوە لە دورەوە چاودێریان دەکات ))

فەریبا : بەڕێزم ؟

کوڕەکەش دەوەستێت و ڕوودەکاتە فەریبا و دەڵێ فەرموو ؟

فەریبا : دتوانم چەند خولەکێک قسەت لەگەڵ بکەم ؟

کوڕەکە : تکا دەکەم فەرموو

فەریبا : دلنیام کە ئێوە کەسێ:ی تێگەشتوون

کوڕەکە : زۆر سوپاس بەڕێزیت

فەریبا : من خێزانی ئێوە لە دوورەوە دەناسم و وەک خوازبێنیکەرێک هاتوومەتە خزمەتت

کوڕەکە پێدەکەنێت و دەڵێ : ئەگەر ئێوە بەو شێوەی کە دەڵێیت خێزانەکەت دەناسم بمانناسیت دەبێ ئەوە بزانی کە ئێمە لە ماڵەوە کچمان نییە !

فەریبا : بە تواوی ئاگادارم ، من بۆ داخوازی لە خودی خۆتان هاتووم !

کوڕەکە بە سەرسوڕمانەوە دەڵێ : بەندە ؟ یانی ئێوە هاتوون بۆ داخوازی من ؟

دواتر پێدەکەنێت و دەڵێ : کامێرای شاراوەیە ؟

فەریبا : نەخێر هیچ کامێرەیەک لە ئارادا نییە من بۆ هاوسەرگیری بەدوای کوڕێکی باش و بەشەخسیەت دەگەڕام کە هاوڕێکانم ئێوەیان پێ ناساندم

کوڕەکە دوبارە پێدەکەنێت و دەسیرێکی چواردەوری دەکات و دەڵێ : کامێرای شاراوەیە ؟

فەریبا : لە خزمەتاندا وتم کە هیچ کامێرەیەک بوونی نییە

کوڕەکە : ئەها پێشبڕکێی ڕادیۆییە ؟

فەریبا : نەخێر بەڕێزم

کوڕەکە : ئەی چییە ؟

فەریبا : سەیر بکەن من بە نیازی مێردهێنانم ، بۆ ئەو مەبەستەش تۆم دەستنیشان کردووە و هەڵمبژاردوویت

کوڕەکە دوبارە پێدەکەنێت و دەڵێت : ئەها لەو ڕاپرسیانەیە هی تەلەفزیۆنەکان ؟

فەریبا : نەخێر بۆ تێناگەن ؟ من دەمەوێت ئێوە بۆ خۆم بهێنم !

پێکەنین لەسەر لێوەی کوڕەکە لادەچێت و دەڵێ : پۆلیسن ؟ من کارێکی خراپم نەکردووە کە بمگرن

دوبارە سەیری ئەملاو ئەولا دەکات و دەڵێ : کامێرای شاراوەیە ؟

فەریبا بە توڕەییەوە دەڵێ : ژەهری مار و کامێرایی شاراوە ! کوا کامێرا ؟ تۆ ئەسڵەن لێرە کامێرا ئەبینی ؟

دوبارە کوڕەکە سەیرێکی ئەملا و ئەولا ئەکات و پێدەکەنێت و دەڵێ : کامێرای شاراوەیە لەناو جانتاکەتدایە ؟

فەریبا : ئەگەر یەک جاری دیکە بڵێی کامێرایی شاراوەیە ئەوا دەکێشم بە دەمتدا کە هەرچی ددان بکەونە دەستتەوە ، وەک مرۆڤ بوەستە و هەرچیم لێ پرسیت وەڵام بدەرەوە

کوڕەکەش کە شهرە دەبینێت خەریکە نزیک دەبێتەوە و مۆبایلی بدەستەوەیە دەترسێت و کەمێ دەچێت دواوە و فەریبا دەڵێ : مەترسە تەنها چەند پرسیارێک دەکەم

کوڕەکەش ڕادەکات

فەریبا دەڵێتە شهرە خێرا تێل بکە بۆ مریەم بڵێ کابرە بەرەو لای تۆ ڕای کرد ئەو سەری کۆڵانی لێ بگرە

مریەمیش ئەو سەری کۆڵان دەگرێت کوڕەکە کە نزیک دەبێتەوە و دەوەستێت سەیری پشتی دەکات فەریبا و شهرە هێواش هێواش دێنە پێشەوە و مریەمسش لە پێشەوە ، کوڕەکە کە زۆر ترساوە جەرەسی هەموو ماڵەکان لێ دەدات دواتر جانتاکەی دەخاتە سەر زەور و بە بۆکس دەکێشێ بە دەرگاکاندا و هاوار دەکات : تکایە خەڵکینە گیانم لە مەترسیدایە تکایە فریام بکەون

سەیر دەکات پەنجەرەکان یەکە یەکە دادەخرێن ئیتر کابرا نائومێد دەبێت و پاڵ دەدات بە دەرگایەکەوە و دەوەستێت بە شێوەی تەسلیم بوون ، چاوی دادەخات لە ناکاو دەنگی ئیستۆپی سەیارە دەبیستێت کە چاو دەکاتەوە دەبینێت سێ سەیارەی پۆلیس وەستاون لەوێ پۆلیسەکان چەکەکانیان بەرەو ڕووی فەریبا و ئەوان کردوون و دەڵێن لە شوێنی خۆتان بوەستن ، بە تۆمەتی کاری بەدڕەوشتی دەستبەسەردەکرێن !

**لە مەرکەزی پۆلیس**

پۆلیسێک فەریبا و ئەوان دەباتە ژورێکەو و دەرگاکە دادەخات ، دوای کەمێ تێدەگەن کە ئەمە ژووری زیندانیانە ! چەند کچێکی تریشی لێیە فریباش لە دانەیەکیان ەپرسێت : ئێوە لێرە چی دەکەن ؟

کچەکە : هەمان ئەو کارەی ئێو کردوتانە !

(( هەموو کچەکانی تر پێدەکەنن ))

فەریبا : بە چی تاوانێک ئێوەیان گرتووە ؟

کچەکە : ئێمە خەریک بوین بە بێدەنگی ئیش و کاسبی خۆمان دەکرت ئێمەیان گرت

یەکێکی تر لە کچەکان : حەتمەن ئێوە گرانفرۆشیتان کردووە ، یەکەی داکۆکیکردن لە بەکارهێنەرەکان شکاتیان کردووە

هەموویان پێدەکەنن

فەریبا : یانی لەوانەشە خەریک بوویت زۆر هەرزان فرۆشتوتە !

هەموویان بێدەنگ دەبن و کچەکە دێتە بەردەم فەریبا و دەڵێت :

ئیتر ئێستە خەریکە هەمووان دەبنە فرۆشیار !

فەریبا : بەڵێ دارمان خواردووە !

یەکێکی تر لە کچەکان : ئێوەیان بۆ گرتووە ؟

فەریبا : بە شوێن مافمانەوە بوین

کچەکە دەپرسێتەوە : ناوتان چییە ؟

فەریبا : من فەریبا ئەمەش شهرە و ئەوەش مریم

ناوی ئێوە چییە ؟

ئەوانیش خۆیان دەناسێنن

لە سوچێکدا سێ کی ١٨ ،١٩ ساڵانی لێیە خەریکن دەگرین

فەریبا : ئەمانەیان بۆ گرتوون ؟

کچەکە : نازانم لەبەردەم زانکۆ ئەوانیان گرتووە

فەریبا سەیرێکیان دەکات کە لەبەردەمیان کتێب و جانتا دانراوە دەچێتە پێشەوە بەلایان ئەوانیش بە خێرایی هەڵدەستنەوە و یەکێکیان بەدەم گریانەوە دەڵێت : بەحوا ئێمە ئەو کارە نین

فەریباش لە باوەشی دەگرێت و ئەویش دەست بە گریان دەکات

**هەمان شوێن – ژورێکی تر**

پۆلیسێک لەلای ئەو کوڕەی کە لەگەڵ فەریبا و ئەوان دەستگیر کرا وەستاوە و پرسیاری لێ دەکات لەگەڵ ئەو کچانە ئیشت چی بوو ؟

کوڕەکە : من ئیشم بەوان نەبوو ئەوان ئیشیان بە من بوو

پۆلیسەکە : چیان لێ ویستیت ؟

کوڕەکە : لەوە دەچوو پرسیاری شوێنێکم لێ بکەن

پۆلیسەکە : ئەتەوێ کڵاو بخەیتە سەر من !!

بێخەمبە تا نیو کاتژمێری تر وەک بولبول قسە دەکەیت

کوڕەکە : لە مێژە وەک بولبول قسە دەکەم

پۆلیسەکە : بێدەنگبە بێنرخ

کوڕەکە : ببورن ئێوە فیلمی ( دەنگی دەریا )تان بینیوە ؟

پۆلیسەکە : بێندەنگ بە هیچ و پوچ

لەو کاتەدا کوڕەکە کە تورە بووە سەری پۆلیسەکە دەگرێت و خۆی دەباتە پێشەوە عەلەساس دەیەوێ وەک فیلمەکە کەلەیەک بدات لە پۆلیسەکە بەڵام کە سەری نزیک دەکاتەوە ناوچاوان ماچ دەکات و دەڵێ : لە خزمەتم قوربان ...!! بە گیانی تۆ ڕوداوەکە بەو شێوە بوو کە وتم ، من ئەسڵەن ئەهلی ئەو شتانە نیم ، مە مەرگی ئێوە ئەگەر درۆ بکەم

پۆلیسەکەش ئەڵێ جارێ دانیشە تا بزانم شتێکت بۆ بکەم

**هەمان شوێن ژووری بەڕێوەبەر**

باوک و باوەژنی و فەریبۆرز لەوێن و فەریبۆرز مەسەلەکەی بۆ بەڕێوەبەر باس کردووە و هەرنەوع بوو کێشەکەیان چارەسەر کرد ، ئەویش دەڵێ بچن ئازادیان بکەن

پۆلیسێک دەچێ بۆ ژوری زیندانیان و دەڵێ فەریبا و شهر و مریم ئازادن بێنە دەرەوە

فەریباش لەو کاتەدا سێ کچە لاوەکە لە جێگەی خۆیان دەنێرێتە دەرەوە

سەرجەم زیندانیەکان لەبەر ئەو بوێریەی فەریبا چەپڵەی بۆ لێدەدەن

کچە لاوەکان دەچنە دەرە و نەجاتیان دەبێت

پاشان بەڕێوەبەر دەڵێت بە پۆلیسەکە ئەی کوا بۆ ئەو کچانەت نەهێنا ؟ مەگەر نەموت ئازادن

پۆلیسەکە : قوربان بە منت نەوتووە بە پۆلیسێکی ترت وت

بەڕێوەبەر : دەی ئەوە ئێستە وتم برۆ ئازادیان بکە و بیانهێنە بۆ ئێرە

پۆلیسەکە دەچێتە ژوری زیندانیان و دەڵێ : فەریبا ، شهرە ، مریم ئازادن بێنە دەرەوە

هەموو زیندانیان دەست بە پێکەنین دەکەن ، پۆلیسەکەش نازانێ مەسەلە چییە

فەریبا و شهرە و مریم دەچنە ژوری بەڕێوەبەر کە فەریبۆرز و ئەوان دانیشتوون

فەریبۆرزیش کە هەموو شتێکی بۆ بەڕێوەبەر باس کردووە ئەڵێت : قوربان ئێستە تێگەشتی مەسەلە چی بووە ؟

بەڕێوەبەر : ئاوا ! هەر بیریشم لە شتی وا نەکردبویەوە ، ئەوە بیست ساڵە لێرەم شتی وام نەبینیبوو ئەوە ئێستە بینیم !

فەریبۆرز : ئێمەش بیرمان لەوە نەکردبوویەوە کە لەم ماوەدا ئەم شتانە ببینین ! بەڵام ئیتر ئەوە بینیمان

بەڕێوەبەر : باشە ڕازی بووم تەواو کێشەکە چارەسەر کرا فەرموون

فەریبۆرز : زۆر سوپاس

پاشان فەریبۆرز ڕوودەکاتە فەریبا و ئەوان و ئەڵێت : هەستن هەستن با لەکاتی جەنابی بەڕێوەبەر نەگرین ئیتر ، ئێستە سەد هەزار کچ و کوڕ لە نێو شەقامەکانن چاوەڕێن کە دەستگیر بکرێن !

فەریبا و ئەوان هەڵدەستن و دەچنە بەردەم مێزی بەڕێوەبەرەکە و کاتێ ەگەنە بەردەمی فەریبا دەڵێت :

ببورن ئێوە هاوسەرگیریتان کردووە ؟

تا ئەوە ئەڵێت کەسێکی تر لەولاوە دەڵێت : جوانی و سەنگینی کچ ئەوەیە کە لەو دیو پەردە دانیشێت و کاتی هاوسەرگیری کەسێک بێتە خوازبێنی و پەسەندی بکات و بە شێوەی سونەت مارەبڕین بکرێت ، ان شاء اللە کە من دواتر لەبارەی ئێوەشەوە بەو شێوە بیر دەکەمەوە .

تا ئەوە دەڵێت فەریبا سەیرێکی دەکات و دەڵێت :

ئێوە چی ؟ ئێوە هاوسەرگیریتان کردووە ؟

کابراش دەڵێت : هاوسەرگیریم کردووە بەڵام هیچ کێشە نییە ! مۆڵەت بدەن ئەم ناونیشانە .......

دەست دەکات بە گیرفانیدا و قەڵەم و وەرەقەیەک دەردەهێنێت کە فەریبا پێی پێدەکەنێت و لەگەڵ شەهرە و مریەم دەڕۆن ، ڕێک لەبەردەم دەرگای ئەو بینایە پاسەوانێکی ناشیرین و تێکشکاو وەستاوە دەستی خستوەتە ناو دەستیەوە و لەگەل جەستەی دەیجوڵێنێت بە شێوەی کچان ناز دەکات ! چاویشی خومار کردووە تا فەریبا دێت لە تەنیشتییەوە بڕوات ، بە هێواشی و لە ژێر لێوەوە دەڵێت :

من هاوسەرگیریم نەکردووە !! لەگەڵ کێتان قسە بکەم ؟؟

## ماڵی فەریبا

فەریبا و شهرە و مریەم و خاڵۆ و باوەژنی لەسەر قەنەفە دانیشتوون ، فریبۆرز قاپی میوەی پێیە فەرموو فەرموو لە کچەکان دەکات و لێشیان تورەیە

فەریبۆرز : ئەمە چی مۆدیلێکی خوازبێنییە ؟ کورەکەتان لە ناوەراستی کۆڵان گرتووە وەک پۆلیسی نهێنی خەریکی لێپێچینەوەن لەگەڵی !

دواتر هاوار دەکات و دەڵێت : ئاخر ئێوە خوازبێنیکەرن یا پۆلیسی تاوان ؟

باوەژن : ئارام بە فەریبۆرز گیان ، ئیتر شتەکە رێکەوت بووە

فەریبۆرز : گریمان ئەوەیان رێکەوت بووە ، خانم لەم کێشە و مشکیلەیا رۆشتووە خوازبێنی لە بەرێوەبەرکە ئەکات !

فەریبا سەری دادەخات و هیچ ناڵێت ، فەریبۆرز سەرەتا قاپی میوەکە دەخاتە بەردەم باوەژن و ئەویش میوەیەک هەڵدەگرێت و دواتر دەیخاتە بەردەم شهرە و بە تالیقەوە ئەڵێت : بخۆ تا گیانت تێبچێت

شهرەش میوەیەک هەڵدەگرێت و دەیخاتە بەردەم مریەم و هەمان شتی پێ ئەڵێ و دواتر ئەڵێت : هەرسێکتان وەک گانگسترا بە مۆبایل و عەینەک چواردەوری کابراتان گرتووە هێشتا وەڵامی خوازبێنیەکەشتان لێی دەوێت ؟ داماوە وشک بووبوو !

هەموویان بە هێواشی پێدەکەنن ، دواتر دوبارە قاپی میوەکان دەخاتە بەردەم مریەم و بە تالیقەوە دەڵێت : مۆزێک بخۆ ، تا هێزت پێ بدات !

دواتر روودەکاتە فەریبا و دەڵێت : خوا رەحمی کرد لەوێ شتەکە کۆتایی پێهات ! ئەگەر جەڵدە لێی بدایە چیمان بکردایە !

قاپی میوەکە دەخاتە بەردەم فەریبا و یەکسەر لای دەباتەوە و ئەڵێ :

نایدەم بە تۆ هەرچی ئاگرە لە گۆری تۆ بەرز دەبێتەوە !

تـا قـاپەکە لادەبـات بە پەلە فەریبـا خەیارێـک هەڵـدەگرێت و بە فەریبـۆرز پێـدەکەنێت ، فەریبۆرزیش سـەیرێکی ئەکات و دەڵێت : ئیلاهـی بەم کـاتە داوات لـێ ئەکەم مێردێکـی کەچەڵی قەڵەوی زۆر بێ ئەدەب ببێت بە نسیبی فەریبا تا دڵم ئاو بخواتەوە !

خالۆ دەڵێت : خو خو خو خو خو .....

فەریبۆرز : بەبێ هۆ خو خو خو خو مەکە فەرموو میوەکەت هەڵگرە

خالۆ : خوا نە نە نە نە نە .....

فەریبۆرز بە شێ،ەی ئەو پیرەژنانەی کە دەیانەوێت نەفرەت بکەن دەستی دەجوڵێنێت و دەڵێت :

ئیلاهی ئەم گیانی منە لە دەستی ئەم دووانە ببەرەوە بۆ لای خۆت

خالۆ : نەکات ( ئیتر قسەکەی تەواو کرد )

فەریبۆرز : دەستت خۆش بێت خالۆ

فەریبا : کوڕەکان خۆیان ترسنۆک بوون کاکە ! ئەگینا چەند کچی جوان ترسی ناوێ

فەریبۆرز : ترسی هەیە و زۆریشی هەیە

فەریبا : ترسی لە کوێدایە ؟

فەریبۆرز : ترسەکە لەوێدایە کە ئێمەی کوڕان وا ڕاهـاتووین کە ئێمە بکەوینە شـوێن کـچ ! کـاتێ پـێچەوانە دەبێـتەوە گومـان دەکەیـن ! چـۆن کـچ دەکەوێـتە شـوێن کـوڕ ؟ ئەویش نەک یەک دانە بەڵکو سێ دانە ! ئەی خوا نمونەتان سەد بەرامبەر بکات !

هەموەیان پێدەکەنن

خالۆ : ایش ایش ایش ایش ایش

فەریبۆرز : خالۆ ایش  و نوش مەکە دڵگران دەبم !

خالۆ : ایشەڵا

فەریبا : باشە ئێوە بەم دڵ و چاونەترسەتانەوە چۆن دەچن ژن بهێنن ؟

فەریبـۆرز : کاتێـک کە ئـێمە بمـانەوێ ژن بهێنـین خـۆ بە تەنهـا نـین چـل کەس لە دەورمانن تاکو نەترسین و ! ئەگەر تەنها بین خۆ لەم هەڵانە ناکەین !

فەریبا بە تورەییەوە کە خەیارەکەشی پێیە خەیارەکە ڕوودەکاتە فەریبـۆرز بە شـێوەی هەڕەشـە کە دەیەوێ قسـە بکـات فەریبـۆرز سـێوەکەی لەدەسـت دەکەوێتە خـوارەوە و دەستی بەرز دەکاتەوە بە شێوەی تەسلیم بوون ! هەموویان دەست دەکەنە پێکەنـین و فەریباش بە پێکەنەوە دەڵێ : هەمووی خەتای تۆیە کاکە !

فەریبۆرز : ئێوە هەستاون ئەم کارەتان کردووە خەتای من چییە ؟

فەریبا : ئەگەر تۆ بهاتیتایە لەگەڵمان ئەوە ڕووی نەدەدا !

فەریبۆرز : من سـەد سـاڵ نـایەم لەگەڵ ئێوە ! هەسـتم لەگەڵ سـێ کـچ بکەومە شـوێن کوڕی خەڵک !

فەریبا : نا ! ئێمە کوڕەکان دەستنیشان دەکەین تۆ بڕۆ بە شوێنیان !

فەربۆرز : بەڵێ ! کە بە تاوانی دەستدرێی بمگرن و بمخەنە زیندانەوە و بە هـۆیەوە لە بەردەم خەڵک حەیام بچێ ؟

خالۆ دەیەوێت قسە بکات خێرا فەریبۆرز دەسـتی وەک T لێدەکات و دەڵـێ تـایم ئـاوت کات بوەستێنن خالۆ دەیەوێت قسە بکات !

خالۆ : نە نە نە نە نە ن .....

فەریبۆرز : ناتەوێ قسە بکەی ؟

خالۆ : نە نەمری کو کو کو کو ڕە !

فەریبۆرز : زۆر سوپاس ، یاری دەستی پێ کردەوە

دواتــر ڕووو دەکــاتە فەریبــا و دەڵــێ : ئەســڵەن ئــێمەی کــوڕان کــاتێ دەمــانەوێ هاوسەرگیری بکەین ئەچین لەگەڵ چەند کوڕێک شوێن کچ دەکەوین تا کچەکە پەنا بۆ دراوسێکان ببات ؟ ڕۆشتن بۆ خوازبێنی یا ڕاونان ؟

فەریبا : ئەی چۆن بچین ؟

فەریبــۆرز : بە ڕێــزەوە ، بە نەرمــی ، لەگەڵ چەپــکە گوڵێــک ! نەک وەک پــۆلیس بە عەینەک و تەلەفۆن !

فەریبا : دەی ئێمەی کچان دەبێ چی بکەین ؟ لە حەقمان خۆش ببین ؟ هەر ئاواش کەم کڵاو نەخراوەتە سەرمان تا ئەمەش چاوپۆشی لێ بکەین ! مافی خۆمان دەبێ وەرگبرین ئیتر !

فەریبۆرز : دروشم بۆ من مەڵێ

دواتر لاسایی فەریبا دەکاتەوە و دەڵێ : مافی خۆمان دەبێ وەرگبرین !! مافی ژن هەر ئەو قاپ و کەوچکەیە کە لە چێشتخانەیە ! هەرکات ویستی پێی دەدەین کە مافی وەرگرێت و بچێ لە ناو قاپەکان چێشت لێبنێت !

فەریبا : هەر ئەوەنە کاکە ؟؟؟!!!

خاڵۆ : وا وا وا وا زززززز ب ب ب بهێنە کو کو کو

فەریبۆرز : خاڵۆ فیلم تەواو بوو سەعات و نیوێک زیاتر نییە ! دەی بڵێ ئیتر !

خاڵۆ : کو کو کوڕە

فەریبا : باشە کاکە ، من ئیتر ئەم قسانە ناکەم یەکەمین خوازبێنیکەر کە هات پێی ڕازی دەبم ئاوا باشە ؟

فەریبۆرز : هەر زۆر نایابە

فەریبا : ئەو کات ویژدانت ڕازییە ؟ دواتر شەوان دەتوانی بە ئیسراحەت بخەویت ؟

فەریبۆرز : بەڵێ ، ئەگەریش نەمتوانی حەبێکی خەو دەخۆم

فەریبا : بەڵام ئەگەر ئێستە دایکم زیندوو بوایە ....

فەریبۆرز : ئەگەر من ئەو دایکەت ببینم !

من دەزانم لەگەڵی

دواتر سەری بەز دەکاتەوە و دەڵێ : ئاخر دایکە گیان خۆت ڕۆشتی بۆ پشوو بۆ بەهەشت ! ئەو کات ئەم گیانکێشەت کردە گیانی منەوە !!

خالۆ : لالالالالالا

فەریبۆرز : خالۆ تۆ تەنها لەم فیلمەدا یەک خولەک دیالۆگت هەبوو ! تا ئێستا حسێبم کردووە نیو سەعاتە قسە دەکەیت !

هەموویان دەست دەکەنە پێکەنین ، بە هیواشی فەریبا ئیشارەت بۆ کچەکان دەکات ئەوانیش بێدەنگ دەبن و بە شێوەی توڕەبوون دادەنیشن ، فەریبۆرز کەمێک بێدەنگ دەبێت و دەڵێت : مریەم خان میوەکەتان بفەرموون ! شهرە خان لەتی بکەن ئیتر !

شهرە و مریم دەڵێت بەسەر چاو بەڵام میوەکان دەخەنە ناو قاپەکان ،

فەریبۆرز : چای دەخۆم بڵێم بە کبرا خان بۆتان بهێنێ ؟

هەردووکیان دەڵێن نەخێر زۆر سوپاس

فەریبۆرز : ئەی نیسکافە ؟

دوبارە دەڵێن نەخێر

فەریبۆرز بە توڕەییەوە دەڵێت : باشە بابە ! باشە ! دەبێ چی بکەم کە لەم دونیا تۆ و لەو دونیا دایکم لێم ڕازی بن ؟

هەموویان چەپڵەی بۆ لێدەدەن و هورایەک دەڵێن و فەریبا چاو بۆ شهرە و مریەم دادەگرێت و فەریبۆرزیش دەیبینێت و دەڵێ :

سەڵەوات بۆ ڕۆحی باوکی ئەگەر ئیتر ببێتە کەری تۆ

هەمویان دیسان پێدەکەننەوە

فەریبا : کاکە بە بۆچونی تۆ دەبێ چی بکەم ؟

فەریبۆرز : هیچ ! بگەڕێن و کوڕێک بدۆزنەوە و تا بچینە خوازبێنی ، ئێستە دەناسن بچین ؟

شهرە : بەڵێ هەیە فەریبۆرز خان

فەریبا چەپڵەیەک لێدەدات و دەڵێ : ئەم عەسرە بڕۆین

باوەژن کە هەر بە بێدەنگی ماوەتەوە لە ناکاو دەڵێت : فەریبۆرز خان منیش بێم ؟

فەریبۆرز : بە ئارەزووی خۆ ، ئەگەر ئێوەش وا بیر دەکەنەوە لە ژیانتاندا کڵاو کراوەتە سەرتان و مافتان خوراوە ئێوەش تەشریف بفەرموون !

باوەژن : ئیلاهی کوڕێکی باش ببێتە قسمەتی ئەم کچە

## لە کۆڵانێک – بەردەم ماڵێک

فەریبۆرز و فەریبا و خاڵۆ و باوەژن جلی جوانیان لەبەر کردووە و لەبەردەم ماڵێک وەستاون ، پاکەتێ شیرینی بەدەست باوەژنەوەیە و چەپکە گوڵێکیش بەدەست فەریباوەیە ، فەریبۆرز بە باوەژن دەڵێت : ئێوە جەرەس لێبدەن

ئەویش جەرەس لێ دەدات و دەڵێن کێیە ؟

باوەژن : سڵاو خاتوون ، میوانتان ناوێ ؟ بابەتێکی خێرە

فەرموون پێڵاوتان سەر چاومان

دەچنە سەرەوە و لەبەردەم دەرگای ژورەوە خانمێک و پیاوێک لەگەڵ کوڕێکی گەنج وەستاون ، فەریبا چەپکە گوڵەکە دەداتە کوڕە گەنجەکە و باوەژنیش شیرینیەکە دەداتە دایکی کوڕەکە ئەوانیش سوپاسیان دەکەن .

دواتر لە ژورەوە فەریبا و ئەوان لە تەنیشت یەکەوە دانیشتوون و کوڕەکە و باوکیشی بەرامبەر ئەمانن ، دایکیشی بە پەلە کراسێک لەسەر قەنەفەکان لادەبات و هەڵی دەداتە ژورێکەوە و دێت دانەیشێت بە شەرمەوە دەڵێت : ببورن کەمێ بێخەبەر هاتن ئاگادار نەبوون ، ئێستە چای پێدەگات و دەیهێنێتە خزمەتتان !

باوەژن : ئەم قسانە چییە خاتوون ، دەڵێن میوانی ناوەختە خواردنی عایدی خۆیەتی

دایکی کوڕەکە : ڕێزتان هەیە ، فەرموون دەمتان شیرین بکەن

باوکی کوڕەکە : شانازی ئەم یەکتر بینینە بەهۆی کێوە بوو ؟

فەریبا : هاوڕێیەکی هاوبەش دواتر لە خزمەتاندا باسی دەکەم

باوک و دایکی کوڕەکە پێدەکەنن و دەڵێن : تکا دەکەین گەورەتان کردین کە هاتن

لە ژورەکەی دیکە کچێکی ١٨-١٩ ساڵان بە پەلە خەریکە سەرو قژی لەبەردەم ئاوێنە چاک دەکات و جار جارێکیش لە درزی درگاکەوە سەیری فەریبۆرز دەکات و زەردەخەنەیەک دەکات ، وا بیر دەکاتەو فەریبۆرز بۆ خوازبێنی ئەم هاتووە !

باوەژن : ببورن چەند ساڵیان ؟

کوڕەکە بە ڕوخساریا دەوری سی ساڵێک دەبێت

بەڵام دایکی بە کچەکە تێگەشتووە دەڵێت دەوری هەژدە نۆزدە ساڵ دەبێت

فەریبـۆرز بە پێکەنیـنەوە دەڵێـت: بەڵـێ ، تەمەن درێـژ بێـت بەڵام کەمێـک زیـاتر دێـتە پێشچاو دەوری ١٧-١٨ ساڵ دێتە پێشچاو

دوبـارە بە هێواشـی پێـدەکەنن ، بـاوک و دایکـی کـچەکە کەمـێ تـوڕە دەبـن ، دایکـی کوڕەکە دەڵێت : منداڵەکەم ئەمساڵ مەکتەبی تەواو کردووە

هەموویان سەریان دەسوڕمێت و لە ژێر لێوەوە پێدەکەنن

فەریبا : ببورن ، لە ئێستادا خەریکی چی ئیشێکە ؟

کوڕەکە چاوی هەر لەسەر فەریبایە ، دیارە حەزی لێ کردووە

دایکی کچەکە : خەریکە خۆی ئامادە دەکات بۆ زانکۆ ، ئێمەش ئیتر خستمانە ئیختیـاری خۆیەوە

فریبۆرز : ببورن ، مەبەستمان ئەوەیە جگە لەوە کاریان چییە ؟ یانی داهاتی چەندە ؟

باوک و دایکی کوڕەکە بە سەرسوڕمانەوە سەیری یەک دەکەن و باوکی دەڵێ :

وەڵا لە ئێسـتادا مـن مـانگی بیسـت سـی هەزار تمەنێکـی پێـدەدەم ، تـا دوایـیش خـوا گەورەیە !

فەریبا : وا نازانن کە ئەم پارەیە کەمێ کەمە ؟

دایکی کوڕەکە : هەڵبەت خەرجی جل و پێڵاو و هاتوچۆ و ناونوسین و ئەوانەی جیایە

دایکەکە بە چپە لای گوێی پیاوەکە دەڵێت : ئاخر پیاو چەند جار پێم وتی مانگانەی ئەم کچە کەمێ زیاد بکە تا لە بەردەم خەڵک شەرمەزار نەبین !

فەریبۆرز بە هێواشی لای گوێی فەریبا دەڵێت : ئەلحەق پەنجەت لەسەر کوڕێکی بـاش داناوە ! ئەگەر خۆمان سەد ماڵ بگەڕاینایە کوڕێکی ئاوامان دەست نەدەکەوت

فەریبـا : ببـورن خـزمەت چـی ؟ دەزانـن کە زۆر گـرنگە ! ( مەبەسـتی خزمەتـی سەربازییە )

دایکی : منداڵەکەم هێشتا کاتی خزمەتی نەگەشتووە ، ئەم چەند ساڵە کە لای خۆمانە هێشتوومانە کە ئیسراحەت بکات

فەریبۆرز : مرۆڤ هەموو کات دەتوانێ خزمەت بکات ! سی و پێنج ساڵی چل ساڵی ئەسڵەن ئەتوانێ چاوەڕێ بکات تا منداڵەکەی بڕواتە خزمەت ! دەتوانی بیکڕی ! دەتوانی بە پارە بیکڕین چارەسەر دەبێت

فەریبا : بۆچونی دەربارەی مارەیی چییە ؟

دایکی : دەی وەک بۆچوونی هەمووان

فەریبا : کەواتە ڕازین ؟

دایکی : بێگومان

فەریبا : بۆچونیان چەندە ؟

دایکی : هەرچەند زیاتر باشتر

فەریبا : واتە ئەگەر ئێمە بڵێین دوو هەزار لیرە ئەم ڕازییە ؟

دایک و باوکی کوڕەکە سەریان دەسوڕمێت و دەڵێن : بێگومان ڕازییە

فەریبۆرز بە چپە دەڵێتە فەریبا : الحمدلله خاڵێکی وەرگرت

فەریبا : ئەی سەبارەت بە ئاهەنگی هاوسەرگیری ؟ ئەگەر بۆ نمونە ئێمە بمانەوێ لە ئۆتیلێکی پێنج ئەستێرە بێت لەگەڵ میوزیک و نان خواردنی چوار سەد پێنج سەد کەس ئێوە ڕازین ؟

دوبارە باوک و دایکی زۆر بە خۆشحاڵییەوە دەڵێن : بێگومان بێگومان

فەریبا : لەگەڵ ئازادی ژن و ڕێزگرتن لە مافەکانی چی ؟ ڕازین ؟

دایک و باوکی کورەکە کە ئیتر لە خۆحالیدا گریانیان دێت دایکی دەڵێت : مەگەر ئیتر ئێمە چیمان دەوێ بۆ منداڵەکەمان خوایە هەزار جار شوکر کە ئێوەی کردە قسمەتی ئێمە ! ئەسڵەن هیچتان نەهێشتەوە کە ئێمە بیلێین !

(( کچەکە خەریکە چایەکان ئامادە دەکات و هەر پێدەکەنێت و وەزعەکەی بەدڵە ))

فەریبا و فەریبۆرز خەریکن بە هێواشی قسە دەکەن

فەریبۆرز : ڕوخساری باشە نەجیبیش دیارە ! لەو کاتەوەی هاتووین سەری بەرز نەکردووەتەوە سەیر بکات !

موبارەکە ان شاء الله

دایکی کوڕەکەش بە هێواشی بە کوڕەکە دەڵێت : ئەگەر بە ئومێدی خودا کاری خوشکت تەواو بوو خوشکی زاواکەش دەهێنین بۆ تۆ چۆنە ؟

کوڕەکەش بە حاڵەتی ڕازی بوون سەری دەلەقێنێ

فەریبا بە هێواشی شتێک بە فەریبۆرز دەڵێت ، فەریبۆرزیش پێی قورسە ئەو قسە بکات بەڵام لە کۆتاییدا دەیلێیت

ببورن دەمەوێ شتێک بڵێم ئەگەر ئیزن بدەن

دایک و باوکی کوڕەکە دەڵێن تکا دەکەین فەرموون

فەریبۆرز : توخوا تو گیانی ئەو کەسەی خۆشتاندەوێت ! ویژدانەن ! ئەگەر ئەم منداڵەتان ئەهلی جگەرە کێشان و ڕەفیقایەتی خراپ و خواردنەوە و ئەوانەیە ئێستە پێمان بڵێن

باوکی تورە دەبێت و دەڵێ : ئەم قسانە چییە بەڕێز

باوەژن : توخوا ناڕەحەت مەبن ! ئیتر ئێوەش گەنجتان هەیە

کوڕەکە بە ئیشارەت بە باوکی دەڵێ ئارام ببەرەوە

باوکیشی کەمێ ئارام دەبێتەوە و دەڵێت : منداڵەکەم لە گوڵ پاکترە بەڕێزم

فەریبۆرز : ئەوە کە ئاشکرا دیارە بەڵام دەڵێم نەوەک لە لاویدا هەندێ شەیتانی کردبێت ! مرۆڤە ئیتر !

ئەم قسانە بە پێکەنەوە دەکات بەڵام باوکی کوڕەکە دوبارە تورە دەبێت و تا دەیەوێ شتێ بڵێ دیسان کوڕەکە و دایکی ئیشارەتی بۆ دەکەن ئەویش بێدەنگ دەبێت

دایکی دەڵێ : نەخێر بەڕێزم ، منداڵەکەم چی پێشتر چی ئێستا پاک و باش بوو و هەیە !

فەریبۆرز : ئیلاهی شوکر ، بەڕاستی ئەم جۆرە کەسانە کەمن ! بەندە بە بەراورد بە خۆم کە گەنجم وتم ! ئیلاهی سەد هەزار جار شوکر

دوبارە بە پێکەنینەوە دەڵێت : ئەڵێم سیغەیەک شتێک لەو بابەتانەی لە جێگەیەک نەبێ!

چاوێکیش لە کوڕەکە دادەگرێت

باوکی کچەکە ئیتر ناتوانێ خۆی کۆنترۆڵ بکات و هاوار دەکات و دەڵێ :

ئاگات لە قسەی دەمت بێت ! ئەسڵەن ئێمە ئەم پەیوەندیەمان ناوێت ! فەرموون ! بەسەلامەت ، خواتان لەگەڵ بێت

هەرنەوع بێت دادەنیشنەوە و باوەژن دەڵێت : ئەی بابە ئێوە کە وەک سارد و گەرم تورە بوون ! نابێت لەبەر یەک قسە بەو شێوە هەڵچن ! لە خوازبێنی ئەم شتانە هەر دەبێ ، دەڵێن شەڕی یەکەم بە سوڵحی ئاخر ، ئێمە گەنجێک دەدەین ئێوەش گەنج ، دەبێ ئیتر ئەم قسانەش هەر بکرێن مەبەستی خراپمان نییە ،

خالۆش شیعرێک دەڵێت کە بە پچڕ پچڕ دەیڵێت وەک قسەکانی

باوکی کوڕەکەش دەڵێ ئەم شیعرە هی کێیە ؟

ئەویش دەڵێت : بابابابابابا تا تا تاهیر

فەریبۆرز : ەئەڵێبەتە هیی باوکی باوکی تاهیرە

هەموویان دەست بە پێکەنین دەکەن کەمێ مەجلیسەکە هێور دەبێتەوە

دایکی کوڕەکە دەیەوێ لە ئەخلاقی باشی کچەکەی قسە بکات ، بۆ ئەوەی وەزعەکە تێک نەچێتەوە فەریبۆرز دەڵێ : ئەی بابە ئەم منداڵەتان هەموو شتێکی باشە ان شاء الله کە کەمێ لەگەڵ یەکتر ئاشنا بوین چەند جارێک لەگەڵ هاوڕێ کوڕەکانمدا دەیبەین و دەچینە گەڕان و زیاتر شارەزای تەبیعەتی دەبین

کاتێک فەریبۆرز ئەمە دەڵێ باوک و کوڕەکە مەمارەکانیان لە توڕەییدا دەردەکەوێت و کوڕەکە هەڵدەستێتەوە و دەڵێ : بێ شەرەف دەتەوێ خوشکی من لەگەڵ هاوڕێ کوڕەکانت ببەیتە دەرەوە ؟

لەم قسانەدا کچەکە لەگەڵ سینیەک چای دێتە هۆڵەکە و کاتێک فەریبۆرز دەیبینێت ئەو کات تێدەگات کە مەسەلە چییە و بۆ ئەمانە توڕە بوون

باوک و کوڕەکە هێرش دەکەنە سەر فەریبۆرز و کوڕەکە دەڵێ : دوو سەعاتە دانیشتووی و خەریکی قسەی هیچ و پوچ دەکەیت هیچمان پێت نەوت ڕوت زیاد بوو !

فەریبۆرز کە لە بەینی باوک و کوڕەکەیە بە پاڕانەوە دەڵێ

بەخوا هەڵەتێگەشتنە ئێوە بە هەڵە تێگەشتوون

کوڕەکە : ئێمە بە هەڵە تێگەشتووین بێ شەرەف ! دەتەوێ خوشکی من ببەیتە گەڕانی پیاوانە !

باوکیشی دەڵێتە کوڕەکەی ڕەحمی پێ مەکە لێی بدە ئەم بێ شەرەفە

ئەویش هاوار دەکات دەڵێ : لێم مەدەن بابا ! هەڵەیەک بووە بەخوا ! یەخوا هەڵە تێگەشتن بووە ئێمە نەهاتووین بۆ خوازبێنی کچەکەتان ! خولەکێک بوەستن تا پێتان بڵێم !

ئەوان کەمێ دەوەستن و کوڕەکە دەڵێ : ئەی هاتوون بۆ خوازبێنی نەنکم ؟

فەریبۆرز : نەخێر هاتووین بۆ خوازبێنی خودی خۆت !

کە ئەمە ئەڵێ ئیتر کوڕ ەکە ئەوەنەی دیکە توڕە دەبێت و دەڵێت : بێ شەرەف گاڵتە بە من ئەکەیت ؟

دوبارە دەست دەکەنەوە بە لێدانی ، فەریبا و ئەوانیش بە هێواشی ڕادەکەنە دەرەوە و دەوەستن ، لەو کاتەدا دەرگای ماڵەکە دەکرێتەوە و فەریبۆرز فڕێ دەدەنە دەرەوە و دەرگا دادەخەن ، فەریبا و ئەوانیش دێن کە بەرزی بکەنەوە فەریۆرزیش هاوار دەکا و دەڵێ : دەتانەوێ چی بکەن ؟ تەلەفۆن بۆ ئامبولانس بکەن

خالۆ : ل ل ل ل لێ ێ ێ یێان دا دا دا دا دایت ؟

فەریبۆرز : بەڵێ ، بەڵام ئەگەر بەو شێوەی ئێوە وتتان بە هێواشی و پچڕ پچڕ لێیان بدامایە کێشە نەبوو

فەریبا زۆر ناڕاحەت دەبێـ و ڕوودەکاتە پەنجەرەی ماڵەکەوە هاوار دەکا دەڵێ : وەحشی !!

کە ئەمە ئەڵێ سەبەتەی چەپکە گوڵەکەی کە بردبویان لە پەنجەرەوە فڕێی دەدەنە خوارەوە بەرەو ڕووی فەریبا ، فەریباش لەسەر سەری فەریبۆرزە و کە دەیبینێت یەکسەر خۆی لادەدات و سەبەتە گوڵەکە دەکێشێ بە سەری فەریبۆرز دوبارە فەریبا دێتەوە شوێنی خۆی و دەڵێ بێ فەرهەنگینە !

ئەمجارە پاکەتە شیرینیەکە فڕێ دەدەن دوبارە فەریبا خۆی لادەدات و بەر فەریبۆرز دەکەوێت

دیسان فەریبا دەچێتەوە شوێنی خۆی و دەیەوێ جنێوێکی تریان پێ بدات کە فەریبۆرز بە حاڵەتی ناڵە و پاڕانەوە دەڵێ : ببورن خاتوون ... ! ( وا بڕیار بوو خاتوو

... لێرە ڕۆڵ ببین ) ئەگەر ئەم هاوکاریانەی تۆ نەوەستێت دەبێ تەرمەکەی من لێرە بجولێنن .!!

## شەو – لە سەربانی ماڵی فەریبا

فەریبا و مریەم و شهرە خەریکن لەگەڵ یەک قسە دەکەن

فەریبا : خوا زەلیلتان بکات بۆ خۆتان و زانیاری نادروستتان ! خەریک بوو کاکەم بکوژن !

شهرە : بە گیانی تۆ فەریبا ئێمە نەماندەزانی ئەو کوڕە کەرە خوشکێکی هەیە !

مریم : ئێستە حاڵی چۆنە ؟

فەریبا : خەوتووە شایانیش لەسەر سەریەتی !

شهرە و مریەم هاتنە ماڵ فەریبا بۆ سەردانکردنی فەریبۆرز ، فەریبۆرز لەسەر قەنەفەیەک خەوتووە و هەر ناڵە ناڵیەتی ، کیسەیەک سەهۆڵیش لەسەر سەریەتی شایانیش لە تەنیشتییەوە دانیشتووە لەسەر کورسیەک ، خاڵۆ و باوکی فەریبا و باوەژنی لەوێن ، فەریبا و ئەوانیش بە هێواشی دێنە هۆڵەکە و سڵاو دەکەن ، فەریبۆرزیش دەیانبینێت پاشان بە شایان دەڵێت : شایان گیان

شایان : بڵێ لێرەم

فەریبۆرز : هەستە ئەمانە بە شەق بکەرە دەرەوە تا بەڵایەکی تریان بەسەرم نەهێناوە

شایان پێدەکەنێت و سڵاو لە فەریبا و ئەوان دەکات و لە شوێنی هەڵدەستێت و شهرە و مریم دێنە پێشەوە و دەڵێن :

سەلامەتییە ان شاء الله ئەم تۆزە ئازارەشت چاک دەبێتەوە

فەریبۆرز کە ئەمە دەبیستێت کیسە سەهۆڵەکە لەسەر سەری لادەبات و بە تورەییەوە دەڵێ : تۆزێ ئازار ؟؟؟؟؟؟ شەل و پەتیان کردم دکتۆر دەرمانی بۆ یەک هەفتە بۆ نوسیوم ئەگەر کچەکەیان بەزەیی نەهاتایەوە پیامدا باوکی و بارکەی لەت لەتیان کردبووم! ئێستە ئەوان هیچ ! دایکی لەو ژێرەوە بە ددانی هەموو گۆشتی لێ کردمەوە.

شایان دەست بە پێکەنین دەکات و خاڵۆیشی پێدەکەنێت ، فەریبۆرزیش سەیرێکی شایان دەکات و دەڵێ : ژەهری مار ! ئێستە کاتی پێکەنینە ؟

باوکی فەریبۆرزیش کە خەریکە پێدەکەنێ دەڵێ : تا ئاقڵ ببی بە پەتی ئەم کچانە نەچیتە ناو چاڵەوە !

فەریبۆرز : بە گیانی تۆ باوکە تا بە کورەکەم وت هاتوین بۆ خوازبێنی تۆ ، دەماری ملی رێک وەک وایەری ئەو گڵۆپەی لێهات !

ڕوودەکاتە فەریبا و دەڵێ : ئەمە هەمان ئەو کورەیە کە دەتوت نەجیبە ها !!!؟؟؟

دوبارە کیسە سەهۆڵەکە دەخاتەوە سەر سەری  و دەڵێ ئاخ دایە مردم

لەو کاتەدا شایان بە هێواشی پارچە کاغەزێک لە گیرفانی دەردەهێنێ و وردی دەکات دەیەوێ فرێی بدات فەریبۆرز دەڵێ : چی بوو ؟

شایان : هیچ

فەریبۆرز : دەڵێم چی بوو ؟

شایان بە شەرمەوە پێدەکەنێ و دەڵێ :

ناونیشانی کەسێکم وەرگرتبوو کە بچینە خوازبێنی!

فەریبۆرز لە جێگەی هەڵدەستێتەوە و بە تورەییەوە دەڵێت : بهێڵە با زەخمەکانم تیمار ببن پاشان !

دەستی دەکاتەوە و دەڵێت :

شـايان بە گیـانی تـۆ بـاوکەکە ئەم دەسـتەمی گرتبـوو و کـوڕەکەش ئەو دەسـتەم تـا خوارەوە منیان ڕاکێشا بە سەر قادرمەکاندا .

پاشـان بە تـوڕەییەوە دەڵێـت : بـاوکە گیـانی مـن ، خوشـکی مـن ، ئێـرە ئێـرانە ! ئێـرە وڵاتێکی پیاوانەیە ! لێرە هەندێ کار هەیە ژن مۆڵەتیان نییە بیکەن ! هەندێ کاریش ئەگەریش مۆڵەتیان هەبێ بیکەن ئەوە خۆیان نایکەن ! لێرە بە بەدبەختی کوڕ دەچێتە خوازبێنی کچ و بە چی هەزار حاڵێک بەڵێ وەردەگرێت و بە موسیبەت هاوسەرگیری لەگەڵ ئەکات ئەو کات نەبوەتە ساڵێ بە کچەکە ئەڵێ تۆیان لە کۆڵ خۆیان کردەوە و تۆیان کردە گیانی منەوە ! ئێستە بیر بکەرەوە کچەکە بچێتە خوازبێنی کوڕەکە چی دەبێت ؟؟!!!

فەریبا بێدەنگ دەبێت و سەری دادەخات ، فەریبۆرزیش دەڵێت : دەی وەڵام بدەرەوە ئیتر ! ئەگەر هەڵە دەڵێم بڵێ هەڵە دەڵێیت !

فەریبا دوبارە بێدەنگ دەبێت و فەریبۆرز دەڵێت : دەی جواب بەرەوە !!

فەریبا بە هێواشی سەری بەرز دەکاتەوە و دەڵێت : ئەگەر ئێستە دایە زیندو بوایە ...

فەریبۆرز : هەزار سەلەوات بۆ ڕۆحی دایکم ! وەڵا بیلا ئەگەر دایە زیندوو بوایە ئێستە و بیبینیـایە کە مـن ئـاوا شــەل و پەت بـووم لایەنگیـری منـی دەکـرد بەڵام ئێسـتا کە مردووە و دەستی لەم دونیا کورتە تۆ لە جێگەی ئەو منی داماو تاوانبار دەکەیت !

فەریبـا دیسـان سـەری دادەخـات ! فەریبـۆرزیش کە بە نـاوی دایکـی هەسـتیارە بە توڕەییەوە بە شایان دەڵێت :

ژمارە تەلەفۆنی ئەو کابرامە بدەرێ

شایان وەرەقەکە دەداتە فەریبۆرز و فەریبۆرز دەڵێت :

ئێستە ئەم کابرا کێیە ؟

شایان بە ئارامی ئەڵێت :

تەلەفۆنی خزمێکە

فەریبۆرز : تۆش لەم کەین و بەینەدا ئەتەوێ کوڕە ترشاوەکانی خزمتان بکەی بە کۆڵ ئێمەوە ؟ ئێستە کام خزمتانە ؟

شایان : کوڕی پورم ، شەو مەوعیدم داناوە لەگەڵیان

فەریبۆرز کەمێ بێدەنگ دەبێت و وەک تەرم خۆی درێژ دەکات و دەڵێت :

انا لله و انا اليه راجعون ! اشهد ان لا اله الا الله

فەریبا : کاکە !!!

فەریبۆرز : کاکە و مەرگ ! دەهێڵی بۆخۆم بە ئارامی بمرم یا نا ؟

فەریبا : ئاخر لە خوازبێنی نابێ ئەو قسانە بکرێت

فەریبۆرز : لەم خوازبێنییە حەتمەن دەبێ بوترێت !

**هەمان شەو بەردەم ماڵێک**

فەریبا و خالۆ و فەریبۆرز و باوەژن شایان لە ئۆتۆمبیلەکە خەریکن دێنە خوارەوە سەرەتا فەریبا و ئەوان دادەبەزن و دەیانەوێ یارمەتی فەریبۆرز بدەن کە بێتە خوارەوە

فەریبۆرز : دەستم لێ مەدەن ! بهێڵن ئارام ئارام خۆم بێمە خوارەوە ! خۆزگ هیچ نەبوایە عەرەبانەیەکتان بۆ بهێنامایە !

لە کۆتاییدا بە ئاخ و ئۆف دادەبەزێت ، فەریبا گوڵێکی گەورە و پاکەتێ شیرینی پێیە کە فەریبۆرز دەیبینێت دەڵێت :

با هیچ نەبوایە کیلۆیەک شیرینیت بکڕیایە ! ئەگەر ئەوە بکێشن بەسەرما توشی خوێنبەربونی مێشک دەبم !

دواتر له حەوشەكە وردە وردە دەچنە سەرەوە كە لەوێ پێنج گەنجی وەرزشكار لەگەڵ پوری شایان و مێردی پوری دێنە پێشوازیان كە فەریبۆرز دەیانبینێت ڕاستەوخۆ بە گەنجەكان دەڵێ :

ئاگاداری مەوزوعەكەن و تێگەیەنراون بۆ هاتوین ؟

گەنجەكان پێدەكەنن

فەریبۆرز : زەهری مار ! ئەڵێم پێشتر پییان وتون یا نا ؟

شایان : بەڵێ فەریبۆرز گیان

فەریبۆرز ڕوو دەكاتە فەریبا و دەڵێ : لەمانە گەورەتر و باشتر دەستناكەوێ ! ئەسڵەن لە بازاڕیش نین

پاشان دەچنە ژورەوە و هەموویان دادەنیشن پاشان فەریبا بە فەریبۆرز دەڵێت :

كاكە ئەمانە خۆیان ناناسێنن ؟

شایان گوێی لێ دەبێت و دەڵێت :

خاتوو فەریبا لێرە ڕاحەت بە هەرچی ئەتەوێ بیڵێ خۆت بیڵێ

فەریبا : تكایە خۆتان بناسێنن !

وحید : ٣٤ ساڵ ، بەكالۆریۆس .. لە ئێستادا بێ كار

فرید : ٣٢ ساڵ ، بەكالۆریۆس ..

نوید : ٢٨ ساڵ ، بەكالۆریۆس ..

سعید : ٣٠ ساڵ ، بەكالۆریۆس ..

حمید ٢٦ ساڵ ، بەكالۆریۆس ..

فەریبا : خۆشحاڵم بە ناسینتان

کوڕەکان دەست دەکەنە پێکەنین و فەریبا دەڵێت :

ئێوە هەمووتان وەرزشکارن ؟

کوڕەکان :

بۆکسێن

هەڵگرتنی قورسایی

کاراتی

لەشجوانی

تۆپی پێ

فەریبا سەیرێکی فەریبۆرز دەکات و دەڵێت : دیارە ئەخلاقیان باشە

فەریبۆرز سەری دەجوڵێنێت و دواتر بە باوک و کوڕەکان دەڵێت :

هەموویان پێکەوە بە چەند ؟ هەرزان بۆمان حسێب بکەن هەموویان دەبەین !

کوڕەکان دەست دەکەنە پێکەنین فەریبۆرز دەڵێت :

ژەهری مار ، هەستن بچن چای بهێنن ! وەحید ڕاکە !

کە فەریبۆرز ئەوە دەڵێت باوک و دایکیان ئیشارەت بۆ کوڕەکان دەکەن کە هەستن چای بهێنن

کوڕەکانیش ئەم بە ئەو دەڵێ تۆ چایی بهێنە هەموشیان لە تەنیشت یەکەوەن ، لە کۆتاییدا شایان پێیان دەڵێت :

هەستن ئیتر !

کوڕەکان یەکە یەکە دەڵێن :

من ناچم

منیش ناچم ! باو ئەو بڕوات

خۆت بڕۆ

تۆ گەورەتری ، خۆت دەبێ بچی !

فەریبۆرز : ئێستە لەسەر چایەک شەڕ مەکەن

دواتر بە تەرتیب بە یەکەمیان دەڵێ تۆ بڕۆ چای بهێنە

تۆ بڕۆ شەکر بهێنە

تۆ شیرینی

تۆ میوە ...

کوڕە بچوکەکەش دەڵێ ئەی من چی بکەم ؟

فەریبۆرز : تۆش هەستە کەمێ سەمامان بۆ بکە !

فەریبا : تۆش بڕۆ مێزکان دانێ بۆ چای

کوڕەکان هەموویان هەڵدەستن هەر یەکەیان و ئیشی خۆی دەکات و چایی و شت دەهێنن و دەیخۆن و دەیخۆنەوە

فەریبۆرز کە خەریکی چای خواردنەوەیە بە فەریبا دەڵێت :

باشن ؟ پێت باشن ؟

فەریبا بە شێوەی ناڕازی دەڵێ :

ئاخر ئەمانە زۆر زل و گەورەن ! جسمیان نەوعێکە

دوبارە سەیرێکی کوڕەکان دەکات و دەڵێ ئێستە ئەگەر قسەم لەگەڵ بکردنایە باشتر دەبوو

فەریبۆرز : چی قسەیەکیان لەگەڵ بکەیت ؟

فەریبا : قسە ئیتر ، دەمەوێ بزانم بیرکردنەوەیان چۆنە !

فەریبۆرز : بتەوێ لەگەڵ یەک بە یەکی ئەمان قسە بکەی تا بەیانی پێدەچێت !

دواتر دەڵێ بە فەریبا بۆستە

سەیرێکی کوڕەکان دەکات و دەڵێ : بۆ تاقیکردنەوە کۆتایی ئامادەن ؟

ئەوانیش سەیرێکی یەک دەکەن و فەریبۆرز دەڵێت :

ئامادەن ؟ دەست پێ بکەین ؟ بەبێ قۆپی !

شایان : تاقیکردنەوەی چی ؟

فەریبۆرز : ناوی خێزان !

دواتر ڕوودەکاتە کوڕەکان و دەڵێ : فەریبا دەست پێ بکە

فەریبا : خواردن ؟

کوڕەکان :

مریشک ، ماسی ، مەعکەرۆنی ، بامیە ، مرەبا لەگەڵ نان

فەریبۆرز : دۆڕایت خۆ ئێمە باسی نانی بەیانیمان نەکردووە

فەریبا : گوڵ ؟

مەریم ، بەیبون ، مێخەک

چوارەمیان کەمێ گیر دەکات و دەڵێت گوڵەبەمانگ !

فەریبۆرز : ئێمە گوڵەبەرۆژەمان بیستووە ئەویش دنکەکانی ! گوڵە بە مانگم نەبیستبوو ! وەڵا تۆش دۆڕای

فەریبا : ڕەنگ ؟

ڕەش ، فستقی ، مشکی

فەریبۆرز : چی مشکێک ؟ مشکی سپی هەیە ڕەش هەیە بۆر هەیە ! تۆش دۆڕایت

فەریبا : شار ؟

میامی ، مۆسکۆ

فەریبۆرز : میامی مسەقەفانەترە ! دۆڕایت !

دواتر ڕوودەکاتە کۆتا کەس و دەڵێ :

پیرۆزبابیت لێ دەکەم لە تاقیکردنەوەی وەزاری یەکەم بویت ! موبارەکە

کوڕەکە : زۆر سوپاس بەڵام !

فەریبۆرز : بەڵام چی ؟

کوڕەکە : ڕاستیەکەی من جارێ ئامادەی زەواج نیم !

فەریبۆرز بە دڵخۆشیەوە سەیرێکی دووەم کەس دەکات ئەویش دەڵێت : منیش دەمەوێ درێژە بە خوێندن بدەم

پاشان بە بێتاقەتیەوە دەڵێت کەسی سێیەم ئەویش کەمێ بیر دەکاتەوە و دەڵێت : من دەمەوێ لەماڵەوە بمێنمەوە و هاوکاری دایک و باوکم بکەم

پاشان بە شێوەی پاڕانەوە دەڵێت کەسی چوارەم ئەویش کەمێ بیر دەکاتەوە وەک ئەوی بیانویەک بدۆزێتەوە خێرا دەڵێت: من تاکو برا گەورەکانم هاوسەرگیری نەکەن هاوسەرگیری ناکەم

دواتر بە گریانەوە دەڵێت پێنجەم ! تو گیانی دایکت تۆش بیانو مەگرە ! تۆ لە هەموویان جوانتر و لەش ڕێکتری و قۆزتری ! ڕێک وەک گوڵیت ! بەهـ بەهـ لەم چاو و برۆ جوانە ! کوڕەکە پێدەکەنێت

فەریبۆرز : بەهـ بەهـ لەو پێکەنینە ! هەزار الله و اکبر دەستی لە دەم و چاویشی نەداوە ئەوەندە جوانە

(( کوڕەکە ڕیشی هەیە ))

فەریبۆرز : ئەگەر دەم و چاوێک لاببات و ژێر برۆیەک بکات لە جوانیا ناتوانی سەیری بکەیت ! تو گیانی ئەو کەسەی خۆشتەوێت ڕەفز مەدە !

کوڕەکە سەری دادەخات و دەڵێت :

ئاخر چی بڵێم ! ڕاستیەکەی ئەمیش جوانە خاتوون ! من دەزانم کە هەموو براکانم ئەمیان بەدڵە بە خۆشمەوە بەڵام ئێوە سەیرێکی هەیکەلی ئێمە بکەن ! ئێسمە سەبی ڕۆژ چۆن لەبەردەم خەڵکی سەر بەرز بکەینەوە ؟ ئەگەر ئەم هەواڵە تەنها بگاتە گوێی خەڵک کە ئێمە پێنج برا بەم هەیکەل و جسمەوە لە ماڵ دانیشتوین و خوازبێنیمان هاتووە چی جوابی خەڵک بدەینەوە ؟ ئەسڵەن چۆن ڕومان بێت سەیری خۆمان بکەین لە ئاوێنە ؟ ئەوەشی کە ڕازی بوین ئێوە بێن لەبەر خاتری ئێوە و شایان بوو !

(( فەریبا کە گوێی لەمانە دەبێت دەست دەکاتە گریان و لە ماڵەکە ڕادەکاتە دەرەوە ))

فەریبۆرز و ئەوانیش دێنە دەرەوە و خواحافیزی لە ماڵەکە دەکەن پاشان دێنە لای سەیارەکە دەبینن فەریبا دیار نییە

کەمێ نیگەران دەبن و دەکەونە دڵەڕاوکێوە !

فەریبۆرز : ئەم کچە بۆ کوێ ڕۆشتووە ؟!

باوەژن : ڕەنگە ڕۆشتبێتەوە بۆ ماڵ

فەریبۆرز مۆبایلەکەی دەردەهێنێت و تەلەفۆن بۆ ماڵەوە دەکات و لەگەڵ باوکی قسە دەکات و دواتر تەلەفۆنەکە دادەخاتەوە بەوانی تر دەڵێت : نەخێر نەچوەتە ئەوێش !

باوەژن : ڕەنگە ڕۆشتبێتە ماڵی شهرە

فەریبۆرز تەلەفۆن دەکات بۆ ماڵ شهرە و پاشان دایدەخات و ئەڵێت لەوێش نییە ! شوێنی تریشی نییە کە بۆی بڕوات

کەمێ بێدەنگ دەبن و لە ناکاو شایان دەڵێت : من دەزانم لەکوێیە

فەریبۆرز : لە کوێ ؟

شایان : با بچین خاڵۆ و ئەوان ببەینەوە ماڵ پێتان دەڵێم .

لە ناو ئۆتۆمبیلەکە خەریکی ڕۆشتنن ، شایان شۆفێری دەکات

فەریبۆرز : بینیت کاک شایان ؟ کاتێ من دەموت شتی وا نابێت ئێوە دەتانوت بە گوێمان ناکەیت و دیکتاتۆریت !

شایان : دەبوایە خۆی ئەزموونی بکردایە و تاقی بکردایەتەوە تا ڕاستیەکانی بۆ دەربکەوتایە

فەریبۆرز : داماوە زۆر دڵی شکا ! کەوتە شوێن هەر کوڕێک ناموس و غیرەتی هەڵگرت و ڕای کرد !

شایان : ئێمە ناموس و غیرەتمان لەگەڵ زۆر شتی دیکە بە هەڵە وەرگرتووە ! خراپی ئیشەکە لێرەدایە !

دواتر فەریبۆرز تسجیلی ئۆتۆمبیلەکە دادەگیرسێنێت و دەیخاتە گۆرانیەکی داریوش ..

**هەمان شەو لە گۆڕستان ( بهشت زهرا )**

فەریبا زۆر نیگەرانە ، ئارام ئارام خەریکی گریانە بە دەم ڕێگاوەیە بۆ لای گۆڕی دایکی دەڕوات و لای گۆڕەکەوە دادەنیشێت ،

فەریبۆرز و شایانیش لە دورەوە وەستاون و سەیری دەکەن

فەریبۆرز دەڵێت : زۆر خەفەتی هەیە !

شایان : بڕۆ بۆلای

فەریبا سەری بەرز دەکاتەوە دەبینێت فەریبۆرز لە بەردەمیەتی و دەبەیەک ئاوی پێیە ، فەریبۆرز زەردەخەنەیەکی بۆ دەکات و دەست دەکات بە شۆردنی بەردی گۆڕەکەی

دایکی ، کاتێ تەواو دەبێت دادەنیشێت و فاتیحەیەک دەخوێنێت و دواتر بە فەریبا دەڵێت :

تۆ کاری خۆتت کرد ! لانی کەم ڕۆژێک سەیری ئاوێنە بکەیت شەرم لە خۆت ناکەیت ! کاتێ بیرت بکەویتەوە کە هەوڵی خۆتت داوە ئارام دەبیەوە !

فەریبا : هەمیشە داوام لە دایکم دەکرد نزام بۆ بکات ! نزا بکات بگەم بە ئارەزووەکانم ! هەمووان دەڵێن نزای دایک گیرایە ، بەڵام دیارە بەراستی دەستی مردووەکان لەم دونیایە کورتە !

فەریبا کەمێ بێدەنگ دەبێت و دەڵێت : لە کوێ زانیت دێم بۆ ئێرە ؟

فریبۆرز : من نەمزانی

بە سەری ئاماژە بۆ شایان دەکات کە لە دورەوە وەستاوە و دەڵێ : شایان زانی زۆر نیگەرانی تۆیە !

فەریبا کمێ بە سەرسوڕمانەوە سەیری دەم و چاوی فەریبۆرز دەکات و دواتر بە خێرایی لە شوێن خۆی هەڵدەستێ و بۆ ئەو شوێنەی کە فەریبۆرز ئاماژەی پێدا سەیری دەکات ، کەمێ دواتر فەریبۆرز دەڵێ

واتە .....!!؟

ڕەنگە !

فەریبا دوبارە سەیری شایان دەکاتەوە

شایانیش خەریکە لەو دورەوە بە نیگەرانییەوە سەیری فەریبا و فەریبۆرز دەکات

فەریبا تازە خەریکە لە تێدەگات لە هەستی شایان بەرامبەر ئەم و هەستی خۆیشی بەرامبەر شایان !

بە ئارامی دەڕواتە لای شایان کاتێ دەگاتە لای شایان دەڵێت :

سلاو خاتوو فەریبا !

فەریبا وەڵام ناداتەوە و تەنها سەیری شایان دەکات و ساتێ دواتر دەڵێ :

تۆ دەستگیرانێ شتێکت نییە ؟

شایان کە خەریکە سەیری چاوی فەریبا دەکات بە سەری وەڵامی نەخێر دەداتەوە

فەریبا : ئەگەر من بێمە خوازبێنیت دەبیە مێردم ؟

شایان بە سەری وەڵامی بەڵێ دەداتەوە

فەریبا : دواتر نایدەیتەوە بە ڕومدا ؟

شایان بە سەری دەڵێ نەخێ ر

فەریبا زەردەخەنەیەک دەکات و لە دەستیدا ئەڵقەیەک دەردەهێنێت و دەستی چەپی شایان دەگرێت و دەیەوێت ئەڵقەکە بکاتە دەستیەوە بەڵام ئەڵقەکە بچوکە و ناچێتە پەنجەی شایان ! ڕاستەوخۆ فەریبا بیرۆکەیەکی بۆ دێت و لە گوێی گوارەیەک لێدەکاتەوە کە لە شێوەی ئەڵقەدایە و دەیکاتە پەنجەی شایانەوە ! هەردوکیان دەست دەکەنە پێکەنین و فەریبا دەڵێت من تۆم مارە کرد !

فەریبۆرز خەریکە بە پێکەنینەوە سەیریان دەکات دواتر دەڵێت :

دیارە مردوەکانیش زۆر دەستیان کورت نییە لەم دونیادا !

دواتر بە حاڵەتی جیدی ڕوو دەکاتە گۆری دایکی و دەڵێ :

سەیر بکە دایە ! تۆ کە لەم دونیا ئەوەنە دەست ئەڕوات کچێکی جوان و باش و خانمیش بۆ من بدۆزەرەوە و بینێرە بۆ خوازبێنیم !

با خاسیەتەکانیت پێ بڵێم تا شتێکی هەڵەم بۆ نەنێریت ! لە خزمەتدا بیڵێم کچێکم دەوێت باڵا بەرز ، چاو و برۆی جوان ، ڕەنگی پێستی .....

## له کۆڵان – بەردەم ماڵی فەریبا

سەیارەی بوک وەستاوە ، فەریبا جلی بوکێنی لەبەردایە ، شایانیش بوەتە زاوا ، خەریکن دەچن سواری سەیارە ببن ، باوک و باوەژنی و فەریبۆرز و شهرە و مریم و چەند کچی تریش لەوێن ، شایان و فەریبا سواری سەیارە دەبن و دەچنە مانگی هەنگوینی !

کاتێ دەکەونە رێ فەریبۆرز کەمێ دەچێتە پێشەوە و دەستیان بۆ ڕادەوەشێنێت و هاوار دەکات دەڵێت :

ئیلاهی فەریبا بچی و ئیتر

دواتر پێدەکەنێ و بە ئارامی دەڵێ : خۆشبەخت بیت

پاشان ڕوودەکاتەوە میوانەکان و دەبینێت شهرە و مریەم و چەند کچێکی تر هەریەکەیان و گوڵێکیان بەدەستەوەیە و بە ڕیز وەستاون و پێدەکەنن !

له ڕاستیدا هەموویان دەیانەوێ خوازبێنی لە فەریبۆرز بکەن !

فەریبۆرز کە ئەوە دەبینێت چەند هەنگاوێک ڕادەکات و دواتر دەوستێت و بە خۆی دەڵێت : بەڕاستی چی کەرێکم ؟! بۆ ڕا بکەم ؟

دواتر دەگەڕێتەوە و بە دەست و پەنجە ژمارە ٤ نیشان دەدات و دەڵێت :

نەفەری یەکەم تا چوارەم مارەیان ئەکەم ئەوانی تریش سغە ! لە سەرەتاوە با پێتان بڵێم دواتر قسە نەکەن .....

ئیتر بە دوعا ...

**کۆتایی**

تایپ و وەرگێران : هێمن محمد

٢٠٢٠/٧/٢٨